له بڵاوكراوەكانی ماڵپەڕی بەهەشت

# گەنجینە گەورەكان
# لە
# چاكە و پاداشتەكان

## (الكنوز العظيمة)

**پێشەكی بۆ نووسینی**

فضيلة الشيخ / صلاح بن محمد البدير

إمام وخطيب المسجد النبوي الشريف

والقاضي بالمحكمة العامة بالمدينة المنورة

**ئامادەكردنی**

**ناصر بن عبد الله بن دخيل الفُهيد**

**وەرگێڕانی**

**مامۆستا محمد عبد الرحمن لطيف**

---

**ماڵپەڕی بەهەشت**

**ba8.org**

**ماڵپەڕێكی ئیسلامی زانستی پەروەردەیی یە و لەپێناو بڵاوكردنەوەی ئەو ئیسلامەیە كە سەلەفی صاڵح - پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵانی (رضي الله عنهم) لەسەری بوون - وە سەر بە هیچ گروپ و لایەنێكی حیزبی نیە.**

## ماڵپەری بەهەشت

**ئەو كتێب و بابەت و لێكۆڵینەوە شەرعیانە بڵاو دەكاتەوە كە دەبنە هۆی:**

١. شارەزاکردنی موسوڵمانان و پەروەردەکردنیان لەسەر ڕێگا ڕاستەکەی ئیسلام، ئەمەش دەستەبەر دەبێ بە گەڕانەوە بۆ پەیڕەوە ڕەسەنەکەی ئیسلام،کە بریتی یە لە قورئان و سوننەت،بە تێگەشتنی پێشین وپێشەوایانی ئوممەت.

٢. پاک کردنەوەی بیروباوەڕ و ڕەوشتی موسوڵمانان، لە دیاردەکانی شیرک و کوفر و تاوان.

٣. پاڵاوتن و تەصفیەکردنی ئاینی ئیسلام لە بیدعە و بۆچونە داهێنراوەکان.

٤. وریا کردنەوەی موسوڵمانان لە شوێنەواری خراپی ڕیوایەتە لاواز و هەڵبەستراوەکان.

٥. پتەو کردنی برایەتی یەکی ڕاستەقینە لەسەر بناغە فراوانە جێگیرەکەی ئیسلام و نەهێشتن و کەمکردنەوەی دەمارگیری مەزهەبی و حیزبی.

**ئامانجمان:**

ئاشناکردنی کۆمەڵگایە لە ئیسلامی ڕەسەن و دروستکردنی تاك و کۆیەتی بۆ تێگەشتن لە سەرچاوەکانی کە بریتین لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی صەحیح و ئاشکراکردنی ئەو شتانەی کە نامۆن بە ئیسلام و خراونەتە نێویەوە بە چەندین دەستەواژەی دەنگ و ڕەنگ و نوسراوی لە بوارەکانی بیروباوەڕ و ڕەوشت و ئاكار و پەروەردە و زانست و پزیشکی و گەشەی کۆمەلایەتی.

**خودایە داوات لێ دەكەین دامەزراومان بكەیت ، وتەوفیقمان بدەیت بۆ هەر كار وگوفتارێكی جوان وچاك بەو شێوەیەیی كەخۆت لێی ڕازیت.**

**ستافی ماڵپەڕی بەهەشت**



## پێشەكی بۆ نووسینی شێخ (صلاح البدير) :

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کـه هـیچ خێـر و چـاکەیەك نـیـیـه ئـیللا لـه لایەن ئەوەوە نەبێت ، سوپاس و ستایشی دەکەم سوپاس و ستایشێك كه پچڕانی نەبێت ، وە شایەتی دەدەم بەوەی کەوا هیچ پەرستراوێك نی‌یە شایستەی پەرستن بێت جگە لە خوا و تەنهایە و بـێ شـەریكە ، بیسـەرە بـۆ ئـەو کەسـەی کـە بـانگی دەکات ، وە نزیکە لـەو کەسـەیش کـە گفتوگـۆی لەگەڵـدا دەکـات ، وە شـایەتیش دەدەم بەوەی کەوا پێغەمبـەرمان و سـەروەرمان (مُحَمَّد) عەبـد و نێـردراوی خوایـە صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێت و لەسەر کەسوکار و هاوەڵانی و ئەوانەیش کە لەسەر ئەو ڕێگایە ڕۆیشتوون و تێکڕای ئەوانەیش کە پەیوەندیان بـەو پـەیڕەوەوە هەیە .

دوای ئەوە :

پــەروەردەکاری ڕێــزدار مامۆســتا (ناصر بن عبد الله بن دخيل الفهيد) ئــەو دانراوەیی کە ناونراوە بە (**گەنجینە گـەورەكان** / الكنوز العظيمة) پیشـاندام و داوای لـێکردم کە پێشەکی‌یەکی بۆ بنووسم ، منیش خواستەکەیم بـۆ بـەجێهێنا و وەڵامی داواکاریەکەیم دایەوە .

وە لەبەر ئەوەی کە ئەم کتێبە بچووکە چەندین ڕێنمایی گرنگ و خێر و چاکەی گەورەی سەلمێنراو بە فەرموودە صەحیحەکان لە خۆ گرتووە ئەوا من ئامۆژگاری دەکەم بە چاپکردن و بڵاوکردنەوەی .

وە داوا لە خوای سەرپەشتیار و بەتواناییش دەکەم کەوا سوودی پێبگەیەنێت بە هەموو ئەوانەی کە دەیخوێننەوە ، وە بە باشترین و تەواوترین پاداشت پاداشتی دانەرەکەی بداتەوە .

وَصَلَّى اللهُ وَسَلَّمَ عَلَى نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ

وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِين

إمام وخطيب المسجد النبوي الشريف

والقاضي بالمحكمة العامة بالمدينة

صلاح بن محمد البدير



## پێشەکی :

الحمد لله ، والصلاة والسلام على رسول الله ، وعلى آله وصحبه ، أمَّا بعد:

لەبەر ئەوەی کە تەمەنی ئوممەتی پێغەمبەرمان (ﷺ) کورتە لە نێوان شەست بۆ حەفتا ساڵ و کەمیان هەیە ئەوە تێپەڕ بکات ، لەبەر ئەوە خوای گەورە هەندێك کردەوەی چاکی وتەیی و کردەیی بۆ فەراهەم و ئاسان کردوون و پاداشتی گەورەشی لەسەر بۆ داناون کە بە هۆیەوە ئیماندار لە بەهەشتدا بەسەر پلە بەرزەکاندا بەرز دەبێتەوە ، وە ئەمەیش بە مەرج گیراوە بە هەبوونی ئیمان و نیاز و نیەت پاکی بۆ خوای گەورە و ئەنجامدانی فەرزەکان و خۆبەدوورگرتن لە تاوانە گەورەکان .

وە من لەم کتێبە بچووکەدا هەندێك لەو کردەوە چاك و زیکرانەی کە موسڵمان لە هەموو کاتێکدا پێویستی پێیەتی کۆکردووەتەوە ، وە تەنها فەرموودە (صەحیح و حەسەن)ەکانم تێدا باسکردووە بە پێی ئەو (تەخریج)ەی کە لە کۆتایی[1] هەموو فەرموودەیەکدا روون کراوەتەوە .

---

[1] تێبینی : بەڵام من هەندێك جار ئەمەم لە پەراوێزی کتێبەکەدا نووسیوە . وەرگێڕ

وە لەبەر ئەوەی کە دونیا کێڵگەی دواڕۆژە و دروێنە کردنی بەروبوومەکانیشی لە ڕۆژی قیامەتدایە ئەوا حەق وایە ئیماندار کاتەکانی بەکاربێنێت لەوەی کە سوودی بۆی هەیە لە دونیا و دواڕۆژدا ، وە سوور بێت لەسەر کۆکردنەوەی چاکە و حەسەناتێکی زۆر زۆر لە چەندین کرداری چاکەی زۆردا لە وتە و کردەوەکان لەگەڵ ئامادەیی دڵ و هەست کردن بە گەورەیی خوای پاك و بەرز و پایەدار بۆ ئەوەی پێی بەختەوەر ببێت لە ڕۆژی قیامەتدا و تەرازووەکەیی پێ قورس ببێت .

ئومێد و رەجام لە خوا ئەوەیە کە سوودی پێبگەیەنێت ، وە پاك و پوختی بکات بۆ ڕوومەتی ڕێزداری خۆی ، وە لە خۆمان و باوك و دایكمان و هەموو موسڵمانان لە پیاوان و ئافرەتان زیندووانیان و مردووانیان خۆش ببێت ، بەڕاستی ئەو خاوەنی ئەوەیە و توانای بەسەردا هەیە ، وە صەڵات و سەلامی خوا لەسەر پێغەمبەرمان (مُحمَّد) و کەسوکار و هاوەڵانی بێت هەر هەموویان .

ناصر بن عبد الله بن دخيل الفُهيد

الرياض

١ / ٧ / ١٤٣١ هـ

## فه‌زڵ و گه‌وره‌یی ته‌وحید و یه‌كخوا په‌رستی

خـوای گـه‌وره فه‌رموویـه‌تی : ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾﴾ [الذاريات] .

واته : من جنۆكه و مرۆڤم دروست نه‌كردووه ته‌نها بۆ په‌رستنی خۆم نه‌بێت .

هه‌روه‌ها فه‌رموویه‌تی : ﴿وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا ﴿٣٦﴾﴾ [النساء].

واته : خوا بپه‌رستن به ته‌نها و هیچ شتێك مه‌كه‌ن به شه‌ریكی .

وَعَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ (رضي الله عنه) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : ((يَا مُعَاذُ أَتَدْرِي مَا حَقُّ اللَّهِ عَلَى الْعِبَادِ وَمَا حَقُّ الْعِبَادِ عَلَى اللَّهِ ؟ قُلْتُ : اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ ، قَالَ : فَإِنَّ حَقَّ اللَّهِ عَلَى الْعِبَادِ : أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلاَ يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا ، وَحَقُّ الْعِبَادِ عَلَى اللَّهِ : أَنْ لاَ يُعَذِّبَ مَنْ لاَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا)) [البخاري : (٢٨٥٦) ومسلم : (١٤٣)] .

واتـه : پێغه‌مبـه‌ری خـوا (ﷺ) فـه‌رمووی : ئـه‌ی (مُعَاذ) ئایـا ده‌زانیـت حـه‌ق و مافـی خوا له‌سه‌ر عه‌بده‌كانی بـریتـی‌یه لـه چـی وه حـه‌ق و مافــی عه‌بده‌كانیش به‌سه‌ر خواوه بریتی‌یه له چی ؟

فه‌رمووی : خوا و پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی زاناترن .

فه‌رمووی : حه‌ق و مافـی خوا له‌سه‌ر عه‌بده‌كانی بریتی‌یه له‌وه‌ی كـه بـه تـه‌نها بیپه‌رستن و هیچ شتێك نه‌كه‌ن به شه‌ریكی .

وه حه‌ق و مافـی عه‌بده‌كانیش به‌سه‌ر خواوه بریتی‌یه له‌وه‌ی كـه : سـزای ئـه‌و كه‌سه نه‌دات كه‌وا هیچ شتێك نه‌كات به شه‌ریكی و هـیچ شـتێك لـه شـیرك بـۆ خـوا ئه‌نجام نه‌دات .

**واتـای شایه‌تیدان به** : (لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ )

واته : هیچ په‌رستراوێك نی‌یه شایسته‌ی په‌رستن بێت جگـه لـه خـوا ، وه ئـه‌م وته‌یه‌یش دوو شت له‌خۆده‌گرێت : (ڕه‌تكردنه‌وه و سه‌لماندن) :

(لَآ إِلَٰهَ) : ڕه‌تكردنه‌وه‌یه بـۆ هـه‌موو ئـه‌و په‌رسـتراوانه‌ی كـه‌وا جگـه لـه (ٱللَّهُ ) ده‌په‌رسترێن و به ناڕه‌وازانینی ئه‌وه‌یه .

(إِلَّا ٱللَّهُ ) : سه‌لماندنـی په‌رستنـه بۆ خـوا به ته‌نها كه شه‌ریـك و هاوبه‌شی نی‌یه .

وه برای موسڵمانم بزانه كه‌وا پێویسته به پـاك و پـوختی عیبـاده‌ت بكرێـت بـۆ خوا به ته‌نها و ده‌شبێت به پێی سوننه‌تی پێغه‌مبه‌ری خوا بێت (ﷺ) .

وه (عیبادەت : پەرستن) : ناوێکی گشتگیر و کۆکەرەوەیە بۆ هەموو ئەوەی کە خوا خۆشی دەوێت و پـێی ڕازیە لە وتە و کردەوە دیار و نادیارەکانیش ، لەوانەش : دوعا و پاڕانەوە و داوای فریاکەوتن و هانا بۆ لا بردن و داوای یارمەتی کردن و سەربڕین و شت لەسەرخۆپێویست کردن و لێترسان و هیوا و ئومێد پێبوون و خوازیاری کردن و ڕاچەڵەکاندن و سوجدەبردن و تەواف کردن .

هەر کەسێك شتێك لەو پەرستنانە بۆ جگە لە خوا ئەنجام بدات چ بۆ وەلی و پیاوچاکێك بێت یان پێغەمبەرێك بێت یان فریشتەیەك بێت یان جنۆکەیەك بێت یان گیانلەبەرێك بێت یان بتێك بێت یان جگە لەوانەش .. ئەوا ئەو کەسە لە پاش ساغ کردنەوەی بەڵگە بەسەریدا موشریك و هاوەڵبڕیاردەرە بۆ خوا و ئەگەر بمرێت و تەوبە نەکات ئەوا بە هەتاهەتایی لە ناو ئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوە و بۆنی بەهەشتی لێحەرام و قەدەغەیە ، ئەمەیش لەبەر فەرمایشتی خوای گەورە : ﴿ إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿٧٢﴾ ﴾ [المائدة] .

واتە : بەڕاستی هەرکەسێك شەریك بۆ خوا دابنێت ئەوا بەدڵنیایی خوا بەهەشتی لێ حەرام و قەدەغە دەکات و جێگای حەوانەوەی ئاگری دۆزەخە ، وە موشریکەکان هیچ کەسێك پشتیوان و تکاکاریان نییە .

هه‌روه‌ها فه‌رمایشتی خـوای گـه‌وره : ﴿ وَمَنۡ أَضَلُّ مِمَّن يَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسۡتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَهُمۡ عَن دُعَآئِهِمۡ غَٰفِلُونَ ۝٥ وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُواْ لَهُمۡ أَعۡدَآءٗ وَكَانُواْ بِعِبَادَتِهِمۡ كَٰفِرِينَ ۝٦ ﴾ [الأحقاف] .

واته : كێ هه‌یه له‌و كه‌سه گومڕاتربێت كه هاوارده‌كاته كه‌سانێك جگه لـه خـوا كه تاوه‌كو ڕۆژی قیامه‌ت وه‌ڵامی ناداته‌وه و ئه‌وانیش بێئاگا و غافڵن لـه پاڕانـه‌وه و هاوارتێكردنه‌كانیان ۝٥ وه كاتێك كه خه‌ڵك حه‌شر ده‌كرێن و كۆده‌كرێنه‌وه لـه قیامه‌تدا ده‌بنه دوژمنیان و بێباوه‌ڕن به په‌رستنه‌كانیان بۆیان .

وه پێغه‌مبه‌ریش (ﷺ) فه‌رموویه‌تی : ((مَنْ لَقِيَ اللهَ لا يُشْرِكُ بِهِ شَيْئَاً دَخَلَ الْجَنَّةَ ، وَمَنْ لَقِيَ اللهَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئَاً دَخَلَ النَّارَ)) [مسلم : (١٥٢)] .

واته : هه‌ركه‌سێك بگات به خوا و هیچ شتێك شیركی ئه‌نجام نـه‌دابێت بـۆ خـوا ئـه‌وا ده‌چـێته به‌هه‌شـته‌وه ، وه هه‌ركه‌سـێكیش بگـات بـه خـوا و شـتێك شـیركی ئه‌نـجام دابێت بۆ خوا ئه‌وا ده‌چێته ئاگره‌وه .

## واتای شایەتیدان بەوەی کەوا (مُحَمَّدٌ ﷺ) پێغەمبەری خوایە

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ ٣١ ﴾ [آل عمران] .

واتە : ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ : ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت ئەوا شوێنی من بکەون ، لە پاداشتی ئەمەشدا خوا خۆشتانی دەوێت و لە تاوانەکانتان خۆشدەبێت .

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْۚ ٧ ﴾ [الحشر] .

واتە : ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆی هێناون لێی وەرگرن و ئەوەشی کە قەدەغەی کردووە لێتان وازی لێبێنن .

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ فَلۡيَحۡذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنۡ أَمۡرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمۡ فِتۡنَةٌ أَوۡ يُصِيبَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ٦٣ ﴾ [النور] .

واتە : با ئەو کەسانە وریا و ئاگاداربن کە سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەر دەکەن لەوەی کەوا توشی فیتنە ببن یان توشی سزایەکی بە ئیش و ئازار ببن .

وە پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموویەتی : ((مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ)) [مسلم : (١٧١٨)] .

واتە : هەرکەسێك هەر کردەوەیەك ئەنجامبدات کە فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ئەوا ئەو کردەوەیە ڕەتدەکرێتەوە و قەبوڵ ناکرێت .

**پێکهاتە و حەقیقەتی ئەم شایەتیدانە ئەمانە لەخۆدەگرێت :**

ـ ئیمان هێنان و باوەڕبوون بە پەیامەکەی و گوێڕایەڵی کردنی لەوەی کە فەرمانی پێکردووە .

ـ وە دوورکەوتنەوە لەوەی کە قەدەغە و ڕێگری لێکردووە و سەرزەنشتی لەسەر کردووە .

ـ وە بەڕاستخستنەوەی لەوەی کە هەواڵی پێداوە .

ـ وە خوا نەپەرسترێت مەگەر تەنها بەو شەریعەتە نەبێت کە ئەو هێناویێتی .

بۆیە پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك سووربێت لەسەر شوێنکەوتنی ئەو سوننەتانەی کە سەلمێنراون و دوورکەوتنەوەش لە بیدعەکان .

## فەزلّ و گەورەیی دوعا كردن

خـــوای گـــەورە فەرموويـــەتی : ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ ﴿٦٠﴾ ﴾ [غافر] .

واتــە : پــەروەردگارتان فەرموويــەتی : ئێــوە داوام لــێبكەن و لـێم بپاڕێنــەوە منيش وەڵامتان دەدەمەوە و دوعاكانتان گیرادەكەم .

وە پێغەمبەريش (ﷺ) فەرموويەتی :

((الدُّعَاءُ هُوَ العِبَادَة))[١].

واتە : دوعا و پاڕانەوە پەرستن و عیبادەتە .

## فەزلّ و گەورەیی گەڕان بەدوای زانستدا

خوای گەورە فەرموويەتی : ﴿وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمًا ﴿١١٤﴾ ﴾ [طه] .

واتە : وە بلّێ : ئەی پەروەردگار علم و زانستم زياد بكە .

وە پێغەمبەريش (ﷺ) فەرموويەتی :

---

[١] الترمذي : (٢٩٧٣) وقال : حسن صحيح ، وصححه الألباني في صحيح الجامع رقم : (٣٤٠٧) .

((مَـنْ سَـلَكَ طَرِيقَـاً يَلْـتَمِسُ فِيـهِ عِلْمَـاً سَـهَّلَ اللَّهُ لَـهُ بِـهِ طَرِيقًـا إِلَى الْجَنَّـةِ)) [مسـلم : (٢٦٩٩)] .

**واتە : هەرکەسێك ڕێگایەك بگرێتەبەر بۆ بەدەست خستنی زانستی شەرعی ئەوا خوای گەورە ڕێگای بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات .**

**هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی :**

((أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنْ يَغْدُوَ كُلَّ يَوْمٍ إِلَى بُطْحَانَ أَوْ إِلَى الْعَقِيقِ فَيَأْتِيَ مِنْهُ بِنَاقَتَيْنِ كَوْمَاوَيْنِ فِي غَيْرِ إِثْمٍ وَلاَ قَطْعِ رَحِمٍ ؟

فَقُلْنَا : يَا رَسُولَ اللَّهِ نُحِبُّ ذَلِكَ .

قَالَ : أَفَلاَ يَغْدُو أَحَدُكُمْ إِلَى الْمَسْجِدِ فَيَعْلَمَ أَوْ يَقْرَأَ آيَتَيْنِ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ خَيْرٌ لَهُ مِنْ نَاقَتَيْنِ ، وَثَلاَثٌ خَيْرٌ لَهُ مِنْ ثَلاَثٍ ، وَأَرْبَعٌ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَرْبَعٍ ، وَمِنْ أَعْدَادِهِنَّ مِنَ الإِبِلِ ؟)) [مسلم : (٨٠٣)] .

**واتە : کێ لە ئێوە پێی خۆشە هەموو ڕۆژێك بەیانیان بڕوات بۆ دۆڵی (بُطْحَان) یان بۆ دۆڵی (الْعَقِيق)* و دوو وشتری کۆپانە گەورە بێنێتەوە بە بێ تاوان و بە بێ پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی ؟**

**وتمان : ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەمان پێخۆشە .**

* ناوی دوو دۆڵن لە شاری مەدینە .

فەرمووی : ئایا بۆ یەکێك لـە ئێـوە بـەیانیان نـاڕوات بـۆ مزگـەوت و فێـری دوو ئایەت ببێت لە کتێبەکەی خوای گـەورە یـان بیانخوێنێتـەوە باشـترە بـۆی لـە دوو وشتر ، وە سێ ئایەتیش باشترە بۆی لە سـێ وشـتر ، وە چـوار ئایـەتیش باشـترە بۆی لە چوار وشتر ، وە بە ژمارەی ئایەتەکان لە وشتر .

## پێنج پایەکانی ئیسلام

١ ـ **شایەتیدان** بەوەی کەوا هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت جگە لە خوا ، وە بەڕاستی (مُحَمَّد)یش (ﷺ) پێغەمبەری خوایە .

٢ ـ ئەنجامدانی نوێژ .

٣ ـ زەکاتدان .

٤ ـ ڕۆژووی ڕەمەزان .

٥ ـ حەج کردنی ماڵی خوا بۆ کەسێك کە توانای هەبێت .

## فەرزێتی و گرنگی نوێژ

خوای گەورە فەرموویەتی :

﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا ﴿١٠٣﴾﴾ [النساء] .

واتە : بەڕاستی نوێژ کاتی بۆ دیاری کراوە لەسەر ئیمانداران .

وە پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموویەتی : ((إِنَّ بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ وَالْكُفْرِ تَرْكَ الصَّلاَةِ)) [مسلم : (٢٥٦)] .

واته : به‌ڕاستی له نێوان پیاوێك و نێوان شیرك و كوفر بریتی‌یه له وازهێنان لـه نوێژ .

## مه‌رجه‌كانی نوێژ نــۆ مه‌رجن

١ ـ موسڵمان بوون .

٢ ـ عاقڵ بوون .

٣ ـ ته‌میزكردن و تێگه‌یشتن و جیاكردنه‌وه‌ی شته‌كان له یه‌كتر .

٤ ـ ڕۆیشتنه ناو كاته‌وه .

٥ ـ پاك و خاوێنی و لابردنی بێنوێژی .

٦ ـ لابردنی پیسی .

٧ ـ داپۆشینی عه‌وره‌ت .

٨ ـ رووكردنه قیبله .

٩ ـ هه‌بوونی نییه‌ت ، وه شوێنی نییه‌ت دڵه و ده‌ربڕینی به زمان بیدعه‌یه .

# پایەکانی نوێژ چواردە پایەن

١ ـ بە پێوە وەستان لەگەڵ هەبوونی توانادا لە نوێژە فەرزەکاندا .

٢ ـ تەکبیرەی ئیحرام [(الله أكبر)ی دابەستنی نوێژ] .

٣ ـ خوێندنی سورەتی فاتیحە لە هەموو رکعاتێکدا .

٤ ـ کڕنوش بردن (الركوع) .

٥ ـ ڕاستبوونەوەی پاش کڕنوش بردن .

٦ ـ سوجدەبردن لەسەر هەر حەوت ئەندامەکە .

٧ ـ ڕاستبوونەوە لە سوجدە .

٨ ـ دانیشتنی نێوان هەردوو سوجدەکە .

٩ ـ ئارامبوون و لەجووڵەکەوتن لە هەموو کردارەکاندا .

١٠ ـ شایەتومانی (تەحیاتی) کۆتایی .

١١ ـ دانیشتن بۆی .

١٢ ـ سەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) .

١٣ ـ سەلامدانەوە .

١٤ ـ ریزبەندی (الترتیب) لە نێوان هەموو ئەم پایانەدا .

وە پایەکانی نوێژ لەگەڵ هەبوونی توانای ئەنجامدانیان لەسەر موسڵمان ناکەوێت نە بە ئەنقەست و نە بە سەهووکردنیش بەڵکو بەوازلێهێنانی نوێژەکە بەتاڵ دەبێتەوە یان ئەو رکعاتەی کە یەکێك لە پایەکانی نوێژی تێدا وازلێهێنراوە بەتاڵ دەبێتەوە ، وە رکعاتەکەی دوای ئەوە جێی دەگرێتەوە .

## فەرزەکانی نوێژ هەشتن

١ ـ هەموو (اللہ أكبر)ەکان جگە لە تەکبیرەی ئیحرام کە روکنە .

٢ ـ وتەی (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيم) لە کڕنووشدا .

٣ ـ وتەی (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَه) بۆ ئیمام و تاك .

٤ ـ وتەی (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْد) بۆ هەمووان .

٥ ـ وتەی (سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى) لە سوجدەدا .

٦ ـ وتەی (رَبِّ اغْفِرْ لِي) لە نێوان هەردوو سوجدەکەدا .

٧ ـ شایەتومانی (تەحیاتی) یەکەم .

٨ ـ دانیشتن بۆی .

جا هەركەسێك بەئەنقەست وازبێنێت له يەكێك له ئەم فەرزانه ئـەوا نوێژەكـەی بەتاڵ دەبێتەوه ، وه ئەگەر به هۆی لەبیرچوونەوه وازی لێهێنـا ئـەوا جێكـەی پـڕ دەكاتەوه به سوجدەی سەهوو ، وه جیاوازی نێوان فەرز و مەرج بريتی‌يـه لـەوەی كه (فەرز / واجب) له ناو خوودی نوێژەكەدايه و (مەرج)يش له پێشەوەيەتی .

وه پێويسته موسڵمان ئامادەی نوێژ ببێت له مزگەوتدا بـه لـەش و پۆشـاكێكی خاوێنەوه كه بۆنی خۆش بێت بۆ ئەوەی ئـەزێتی نوێژخوێنـەكان نـەدات ، چـونكه پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری كردووه له ئامادەبوونی مزگـەوت بـۆ كەسـێك كـه سـیر يـان پيازی خواردبێت .

## فەزڵ و گەورەيی دەستنوێژ و خشوع له نوێژدا

پێغەمبــەر (ﷺ) فەرموويــەتی : ((مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ فَيُبْلِغُ [أَوْ : فَيُسْبِغُ] الْوُضُوءَ ، ثُمَّ يَقُولُ : أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ، إِلاَّ فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةِ ، يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ)) [مسلم : (٢٣٤)] .

وَزَادَ التِّرْمِذِيُّ : ((اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنْ التَّوَّابِينَ ، وَاجْعَلْنِي مِنْ الْمُتَطَهِّرِينَ)) [سنن الترمذي : (٥٥)] .

واته : هەريـەكێك لـه ئێـوه دەسـتنوێژ بگرێـت ، دەسـتنوێژێكی بـاش و كـامڵ بگرێـت و ئـەنجا بڵێـت : (أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ، اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنْ التَّوَّابِينَ ، وَاجْعَلْنِي مِنْ الْمُتَطَهِّرِينَ : شـايەتی دەدەم

کەوا هیچ پەرستراوێك نىیە شایستەی پەرستن بێت جگە لە خوا نـەبێت تەنهایـە و بێ شەریکە ، وە شایەتیش دەدەم کەوا مُحَمَّد عەبد و پێغەمبـەری خوایـە ، خوایـە بمکـە بـە یـەکێك لـە تەوبـەکاران ، وە بمکـە بـە یـەکێك لەوانـەی کـە خۆیـان پـاك دەکەنەوە) ئیللا هەر هەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە ، لە هـەر کامیـان دەچێــتە ژوورەوە ویستی خۆیەتی .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((مَا مِنِ امْرِئٍ مُسْلِمٍ تَحْضُرُهُ صَلاَةٌ مَكْتُوبَةٌ فَيُحْسِنُ وُضُوءَهَا وَخُشُوعَهَا وَرُكُوعَهَا إِلاَّ كَانَتْ كَفَّارَةً لِمَا قَبْلَهَا مِنَ الذُّنُوبِ مَا لَمْ يُؤْتِ كَبِيرَةً ، وَذَلِكَ الدَّهْرَ كُلَّهُ)) [مسلم : (٥٦٥)] .

واتــە : هــیچ موســڵمانێك نــیـە نوێــژێکی فــەرزی لــێبێتەپێش و جــوان دەستنوێـژی بۆ بگـرێـت و خشـوع و کـڕنوشـەکـەی باش بێت ئـیللا ئـەوە دەبێتـە هـۆی سـڕینەوەی تاوانـەکانی پـێش خـۆی ئەگـەر تـاوانی گـەورەی نـەکردبێت ، ئەوەیش بۆ هەموو ساتە وەختێکە .

## فەزڵ و گەورەیی زوو ڕۆیشتن و ڕێکردن بۆ نوێژی جومعە

عَنْ أَوْسِ بْنِ أَوْسٍ الثَّقَفِيِّ (﵁) قَالَ : سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ : ((مَنْ غَسَّلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاغْتَسَلَ ، وَبَكَّرَ وَابْتَكَرَ ، وَمَشَى وَلَمْ يَرْكَبْ ، وَدَنَا مِنَ الإِمَامِ ، فَاسْتَمَعَ وَلَمْ يَلْغُ ، كَانَ لَهُ بِكُلِّ خُطْوَةٍ عَمَلُ سَنَةٍ : أَجْرُ صِيَامِهَا وَقِيَامِهَا))[٢].

**واتە : هەرکەسێك لە ڕۆژی جومعەدا سەر و لەشی بشۆرێت ، ئەنجا زۆر زوو بڕوات بۆ مزگەوت ، وە بە پێ بڕوات و بە سواری نەچێت ، وە نزیك ببێتەوە لە ئیمام ، وە گوێ بگرێت و خۆی سەرقاڵ نەکات ، ئەوا بە هەر هەنگاوێك کردەوەی ساڵێکی بۆ دەنووسرێت : پاداشتی بە ڕۆژووبوونی و شەونوێژکردنیشی .**

## لێکدانەوەی ئەم فەرموودەیە

((مَنْ غَسَّلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاغْتَسَلَ)) ، ((غَسَّلَ)) : **واتە : سەری شۆرد بە تایبەت ،** ((وَاغْتَسَلَ)) **واتە : تێکڕای لەشی شۆرد .**

((وَبَكَّرَ)) : "النووي" **فەرموویەتی : واتە : لە سەرەتای کاتەکەدا ڕۆیشت .**

((وَابْتَكَرَ)) : **واتە : گەیشتە سەرەتای وتارەکە ، وە وتراویشتە دووبارەی کردووەتەوە بۆ جەخت لەسەرکردنەوە ، وە** "ابن الأثير" **لە کتێبی** "النهاية"**دا**

---

[٢] رواه الترمذي : (٤٥٦) وأبو داود والنسائي وأحمد وابن ماجه وابن خزيمة ، وصححه الألباني في صحيح الترغيب : (٦٩٠) وصحيح الجامع : (٦٤٠٥) .

فەرموویەتی : ((بَكَّرَ)) : واتە : ڕۆیشت بۆ نوێژی جومعە لە سەرەتای كاتەكەیدا ، وە هەر كەسێك خێرا بڕوات بۆ شتێك ئەوا دەوترێت (بَكَّرَ إِليهِ) ، بەلاّم ((ابْتَكَرَ)) واتە : گەیشتوتە سەرەتای وتارەكە ، وە سەرەتای هەموو شتێك پێی دەوترێت (باكورته) .

((وَمَشَى وَلَمْ يَرْكَبْ)) : "الخطابي" فەرموویەتی : واتای هەردووكیان یەك شتە و بۆ جەخت لەسەركردنەوەیە .

((وَدَنَا مِنَ الإِمَامِ)) : واتە : نزیك دەبێتەوە لە ئیمام ، ئەمەیش هاندانە بۆ بەدەست خستنی فەزڵ و خێری ڕیزی یەكەم .

((فَاسْتَمَعَ)) : واتە : بە جوانی گوێی بۆ گرت ، وە ئەمەیش ئەوەی تێدایە كەوا دەبێت هەردووكیان كۆبكاتەوە ، چونكە ئەگەر گوێ بگرێت و دوور بێت یان نزیك بێت و گوێنەگرێت ئەوا ئەم پاداشتەی دەست ناكەوێت .

((وَلَمْ يَلْغُ)) : واتە : گوێ لە وتارەكە بگرێت و سەرقاڵ نەبێت بە جگە لە وتارەكەوە .

"النووي" فەرموویەتی : واتە : قسە نەكات ، چونكە قسەكردن لە كاتی وتاردا قسەی بێكەڵكە .

((كَانَ لَهُ بِكُلِّ خُطْوَةٍ)) : مەودای نێوان هەردوو پێ ، واتە هەنگاوێك .

((عَمَلُ سَنَةٍ : أَجْرُ صِيَامِهَا وَقِيَامِهَا)) : **واتــه : پاداشــتی ســاڵێك بـه ڕۆژووبـوون و شه‌ونوێژكردن[1] .**

## فه‌زڵ و گه‌وره‌یی زوو ڕۆیشتن بۆ نوێژی جه‌ماعه‌ت و ڕیزی یه‌كه‌م

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ : ((لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الْأَوَّلِ ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلَّا أَنْ يَسْتَهِمُوا عَلَيْهِ لَاسْتَهَمُوا ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي التَّهْجِيرِ لَاسْتَبَقُوا إِلَيْهِ ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي الْعَتَمَةِ وَالصُّبْحِ لَأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا)) [البخاري : (٦١٥)] .

**واته : ئه‌گه‌ر خه‌ڵكی بزانن چی پاداشتێك له بانگـدان و ریـزی یه‌كه‌مـدا هه‌یـه و ئه‌نجا هیچیان ده‌ست نه‌كه‌وتایه‌ت ئیللا ئه‌وه نه‌بێت كه تیروپشكی بـۆ بكـه‌ن ئـه‌وا تیروپشكیان بۆی ده‌كرد ، وه ئه‌گه‌ر بشزانن له زوو ڕۆیشتندا بۆ مزگه‌وت چ خێـر و پاداشتێكی له‌سه‌ره ئه‌وا ده‌ستپێشخه‌ریان بۆی ده‌كرد ، وه ئه‌گه‌ر بشـزانن نوێـژی عیشا و به‌یانیان چ خێر و پاداشتێكیان تێدایه ئه‌وا ده‌ڕۆیشتن بۆ ئاماده‌بوونیان به جه‌ماعه‌ت ئه‌گه‌ر چی به گاوڵكێ و له‌سه‌ر ئه‌ژنۆكانیش بێت .**

---

[1] كه‌واته ئه‌گه‌ر له نێوان ماڵتان و مزگه‌وتی جه‌ماعه‌ت بۆ نــموونه مــه‌ودای (١٠٠٠) هــه‌نگاو بێت ئه‌وا ئه‌جر و پاداشتی (١٠٠٠) ساڵت بۆ ده‌نووسرێت ، وه‌كو ئه‌وه‌ی كه هه‌زار ساڵ به ڕۆژه‌كه‌ی به ڕۆژووبووبیت و به شه‌وكه‌شی شه‌ونوێژت كردبێت .

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ : أَتَى النَّبِيَّ (ﷺ) رَجُلٌ أَعْمَى فَقَالَ : يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّهُ لَيْسَ لِي قَائِدٌ يَقُودُنِي إِلَى الْمَسْجِدِ ، فَسَأَلَ رَسُولَ اللهِ (ﷺ) أَنْ يُرَخِّصَ لَهُ فَيُصَلِّيَ فِي بَيْتِهِ ، فَرَخَّصَ لَهُ ، فَلَمَّا وَلَّى دَعَاهُ فَقَالَ : هَلْ تَسْمَعُ النِّدَاءَ بِالصَّلاَةِ ؟ فَقَالَ : نَعَمْ ، قَالَ : فَأَجِبْ)) [مسلم : (٦٥٣)] .

**واتە : پیاوێکی نابینا هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و وتی : ئەی پێغەمبەری خوا من هیچ کەسێکم نی‌یە دەستم بگرێت بۆ مزگەوت ، ئەوەبوو داوای کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە روخسەت و مۆڵەتی بدات لە ماڵەکەی خۆیدا نوێژ بکات ، پێغەمبەریش (ﷺ) مۆڵەتی پێدا ، پاشان کاتێك کە ڕۆیشت پێغەمبەر (ﷺ) بانگی کرد و فەرمووی : ئایا گوێت لە بانگ دەبێت بۆ نوێژ ؟ وتی : بەڵێ ، فەرمووی : کەواتە وەڵامی بانگەکە بدەرەوە .**

## فەزڵ و گەورەیی زیکری دوای نوێژە فەرزەکان

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (ﷺ) قَالَ : ((أَنَّ فُقَرَاءَ الْمُهَاجِرِينَ أَتَوْا رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالُوا : ذَهَبَ أَهْلُ الدُّثُورِ بِالدَّرَجَاتِ الْعُلَى وَالنَّعِيمِ الْمُقِيمِ .

فَقَالَ : وَمَا ذَاكَ ؟

قَالُوا : يُصَلُّونَ كَمَا نُصَلِّي ، وَيَصُومُونَ كَمَا نَصُومُ ، وَيَتَصَدَّقُونَ وَلاَ نَتَصَدَّقُ ، وَيُعْتِقُونَ وَلاَ نُعْتِقُ .

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : أَفَلاَ أُعَلِّمُكُمْ شَيْئًا تُدْرِكُونَ بِهِ مَنْ سَبَقَكُمْ وَتَسْبِقُونَ بِهِ مَنْ بَعْدَكُمْ وَلاَ يَكُونُ أَحَدٌ أَفْضَلَ مِنْكُمْ إِلاَّ مَنْ صَنَعَ مِثْلَ مَا صَنَعْتُمْ ؟

قَالُوا : بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ .

قَالَ : تُسَبِّحُونَ وَتُكَبِّرُونَ وَتَحْمَدُونَ دُبُرَ كُلِّ صَلاَةٍ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ مَرَّةً .

قَالَ : فَرَجَعَ فُقَرَاءُ الْمُهَاجِرِينَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) فَقَالُوا : سَمِعَ إِخْوَانُنَا أَهْلُ الأَمْوَالِ بِمَا فَعَلْنَا فَفَعَلُوا مِثْلَهُ .

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ))[1].

**واتە : فەقیر و هەژارەکانی موهاجرین هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا خاوەن سامان و پارە زۆرەکان پلە بەرزەکان و خۆشگوزەرانی هەمیشەییان بردووە .**

**فەرمووی : ئەوە چی‌یە ؟**

---

[1] صحيح مسلم : (١٣٧٥) ، أهل الدثور : أي أهل الأموال الكثيرة .

وتیان : ئەوان نوێژ دەکەن وەکو چۆن ئێمە نوێـژ دەکـەین ، وە ڕۆژوو دەگـرن وەکو چۆن ئێمە ڕۆژوو دەگرین ، وە خێر و صەدەقە دەکەن و ئێمە نایکـەین ، وە کۆیلە ئازاد دەکەن و ئێمە نایکەین .

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : باشە شتێکتان فێرنەکەم کە پـێ‌ی بگـەن بـە ئەوانەی پێش خۆتان و پێش ئەوانـەی دوای خۆتـانیش بکـەون و هـیچ کەسـێکیش نەبێت باشتر بێت لـە ئێـوە ئـیللا مەگـەر کەسـێك نـەبێت کـە وەکـو ئـەوەی ئێـوە بکات؟

وتیان : بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا .

فــەرمووی : (سُبْحَانَ اللَّهِ) و (اللَّهُ أَكْبَرُ) و (الْحَمْدُ لِلَّهِ) دەڵــێن لــە پــاش هــەموو نوێژێکی فەرز سی و سێ (٣٣) جار .

پاشان فەقیر و هەژارەکانی موهاجرین گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) و وتیان : ئەی پێغەمبەری خوا برا خـاوەن پارەکانمـان ئـەوەی کـە ئێمـە کردمـان بیستیان و ئەوانیش وەکو ئەوەی ئێمە دەکەن ؟

پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فـەرمووی : ئـەوە فـەزڵی خوایـە و دەیـدات بـە هـەر کەسێك کە ویستی لـێ‌ی ببێت .

## فەزڵ و گەورەیی خوێندنی (آية الكُرسي) دوای هەموو نوێژێك

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((مَنْ قَرَأَ آيَةَ الْكُرْسِي دُبُرَ كُلِّ صَلاَةٍ مَكْتُوبَةٍ لَمْ يَمْنَعْهُ مِنْ دُخُولِ الْجَنَّةِ إِلاَّ أَنْ يَمُوتَ))[1].

واتە : هەرکەسێك لە دوای هەموو نوێژێکی فەرزەوە (آية الكُرسي) بخوێنێت هیچ شتێك نابێتە ڕێگری لە چوونە ناو بەهەشتەوە تەنها ئەوە نەبێت کە بمرێت .

## فەزڵ و گەورەیی نوێژ کردن لە هەردوو حەرەمی ڕێزداردا

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((صَلاَةٌ فِي مَسْجِدِي هَذَا أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ صَلاَةٍ فِيمَا سِوَاهُ إِلاَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ ، وَصَلاَةٌ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ أَفْضَلُ مِنْ مِائَةِ أَلْفِ صَلاَةٍ فِيمَا سِوَاهُ))[2].

واتە : تەنها نوێژێك لە نێو مزگەوتی پێغەمبەردا (ﷺ) باشترە لە هەزار نوێژی نێو مزگەوتەکانی تر جگە لە مزگەوتی حەرەم نەبێت ، وە تەنها نوێژێك لە نێو مزگەوتی حەرەمدا باشترە لە سەد هەزار نوێژی نێو مزگەوتەکانی تری جگە لە خۆی* .

---

[1] رواه ابن حبان ، وصححه الألباني في الجامع الصغير : (٦٤٦٤) .

[2] رواه أحمد : (١٥٢٧١) وابن ماجه : (١٤٠٦) ، وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب : (١١٧٣) .

* مەبەستی ئەوەیە : ئەنجامدانی تەنها یەك نوێژ لە حەرەمی مەککەدا باشترە و پاداشتی زیاترە لە ئەنجامدانی پێنج نوێژە فەرزەکان ئەگەر لە جگە لە حەرەمی مەککەدا بکرێن بۆ ماوەی (٥٥ ساڵ و ٦ مانگ و ٢٠ ڕۆژ) ، وە

هـه‌روه‌ها پێغه‌مبـه‌ر (ﷺ) فه‌رموویـه‌تی : ((مَنْ تَطَهَّرَ فِي بَيْتِهِ ثُمَّ أَتَى مَسْجِدَ قُبَاءٍ فَصَلَّى فِيهِ صَلاَةً كَانَ لَهُ كَأَجْرِ عُمْرَةٍ))[1].

واته : هه‌ر كه‌سێك له ماڵه‌كه‌یدا ده‌ستنوێژ بگرێت و ئه‌نجا بچێت بـۆ مزگـه‌وتی (قُباء) و نوێژێكی تێدا بكات ئه‌وا ئه‌جر و پاداشتی عومره‌یه‌كی بۆ هه‌یه .

وه له فه‌زڵه‌كانی تری مه‌ككه و مه‌دینه ئه‌وه‌یه كه ده‌ججال ناچێته ناویانه‌وه .

## فه‌زڵ و گه‌وره‌یی عومره كردن له ڕه‌مه‌زاندا

پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فـه‌رموویـه‌تی : ((عُمْرَةٌ فِي رَمَضَانَ تَقْضِي حَجَّةً مَعِي)) [البخاري : (١٨٦٣)] .

واته : عومره‌یه‌ك له ڕه‌مه‌زاندا جێی حه‌جێك ده‌گرێته‌وه له‌گه‌ڵ مندا* .

---

ئه‌نجامدانی ته‌نها یه‌ك نوێژ له حه‌ره‌می مه‌دینه‌دا باشتره و پاداشتی زیاتره له ئه‌نجامدانی پێنج نوێژه فه‌رزه‌كان ئه‌گه‌ر له جگه له حه‌ره‌می مه‌دینه‌دا بكرێن بۆ ماوه‌ی (٦ مانگ و ٢٠ ڕۆژ) ، واته : خێر و پاداشتی ته‌نها یه‌ك نوێژی ناو ماڵی خوا زیاتره له خێر و پاداشتی كردنی پێنج نوێژه فه‌رزه‌كان بۆ مـاوه‌ی (٥٥ سـاڵ و ٦ مـانگ و ٢٠ ڕۆژ) لـه ته‌مه‌ن .

[1] رواه ابن ماجه : (١١٦٨) ، وصححه الألباني في صحيح الجامع الصغير : (٦١٥٤) .

* [مه‌به‌ستی ئه‌وه‌یه : ئه‌نجامدانی عومره‌یه‌ك له مانگی ڕه‌مه‌زاندا وه‌كو ئه‌وه وایه كه حـه‌جێك بكه‌یت له‌گه‌ڵ خودی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) خۆیدا] . ـ وه‌رگێڕ ـ

## فەزڵ و گەورەیی

## دانیشتن لە شوێنی نوێژدا دوای نوێژی بەیانی

عن أَنَسٍ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : ((مَنْ صَلَّى الْغَدَاةَ فِي جَمَاعَةٍ ثُمَّ قَعَدَ يَذْكُرُ اللَّهَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ كَانَتْ لَهُ كَأَجْرِ حَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ)) ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : ((تَامَّةٍ تَامَّةٍ تَامَّةٍ))[١].

**واتە : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : هەرکەسێك نوێژی بەیانی بە جەماعەت بکات ئەنجا دانشێت زیکری خوا بکات تاوەکو خۆر هەڵدێت ئەنجا دوو رکعات نوێژ بکات ئەوە وەکو پاداشتی حەج و عومرەیەکی تەواو تەواو تەواو وایە .**

## لە کردار و ئاکارەکانی پێغەمبەر (ﷺ)

❁ **ئەگەر دەتەوێت کەنزێك لە کەنزەکانی [گەنجینەیەك لە گەنجینەکانی] بەهەشتت بۆ ببێت ئەوا بڵێ :** (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ) [البخاري : (٧٣٨٦)] .

[١] رواه الترمذي : (٢ / ٥٨٦) وقال : هذا حديث حسن غريب تحقيق أحمد شاكر وحسنه الألباني في صحيح سنن الترمذي برقم : (٥٩١) ، ولهذا الحديث شواهد ، وقال الشيخ ابن باز حديث صحيح ويُعملُ به ، مسائل أبي عمر السدحان للإمام ابن باز : (١ / ٣٦) .

❁ ئەگەر دەتەوێت لە بەهەشتدا دار خورمایەکت بۆ بچێنرێت ئەوا بڵێ : (سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ وَبِحَمْدِهِ) [الترمذي : (٣٤٦٤)] .

❁ ئەگەر دەتەوێت لەوە باشترت بۆ ببێت کە خۆری بەسەردا هەڵدێت ـ واتە : لە هەموو دونیا باشتر بێت ـ ئەوا بڵێ : (سُبْحَانَ اللَّهِ ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ) [مسلم : (٧٠٢٢)] .

❁ ئەگەر دەتەوێت خوا لە تاوانەکانت خۆشببێت ئەگەر چی وەکو کەفی دەریایش بێت ئەوا ڕۆژانە (١٠٠) جار بڵێ : (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ) [البخاري : (٦٤٠٥)] .

❁ ئەگەر دەتەوێت فریشتە دوعات بۆ بکات ئەوا تۆیش لە پشت غەیبەوە [واتە : بێ ئەوەی کەس بزانێت] دوعا بۆ براکەت بکە [مسلم : (٢٧٣٢)] .

❁ ئەگەر دەتەوێت خوا بەهەشتت بۆ مسۆگر بکات ئەوا بڵێ : (رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا ، وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا ، وَبِمُحَمَّدٍ ﷺ رَسُولاً) [أبو داود : (١٥٢٩) ، و صحه الألباني] .

❁ ئەگەر دەتەوێت ئەوەندە پاداشتت بۆ ببێت وەکو ئەو کەسەی کە (١٠) کۆیلەی ئازاد کردبێت ، وە (١٠٠) حەسەنە و چاکەیشت بۆ بنووسرێت ، وە (١٠٠) خراپەیشت لەسەر بسڕێتەوە ، وە ئەو ڕۆژە تاوەکو ئێوارە بۆت ببێت بە پارێزەر لە شەیتان ئەوا ڕۆژانە (١٠٠) جار بڵێ : (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ ،

لَـهُ الْمُلْـكُ وَلَـهُ الْحَمْـدُ ، وَهُـوَ عَلَـى كُـلِّ شَـيْءٍ قَـدِير) [البخـاري : (٣٢٩٣) ، ومسـلم : (٧٠١٨)] .

**ئەگەر دەتەوێت خوا لە ناڕەحەتیەكانی ڕۆژی قیامەت ڕزگارت بكات ئەوا دەرگای تەنگانە لە كەسێكی قەرزاری نەدار بكەرەوە یان قەرزی لەسەر دابشكێنە*** [مسلم : (٤٠٨٣)] .

**ئەگەر دەتەوێت خوا لە تاوانەكانی پێشووت خۆشببێت ئەوا لە پاش كۆتایی پێهێنانی نان خواردن بڵێ :** (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنِي هَذَا وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلاَ قُوَّةٍ) [صحيح الترمذي : (٣٤٥٨) ، وصحيح ابن ماجه : (٢٦٧٣)] .

**ئەگەر دەتەوێت ئەوەندە پاداشتت بۆ ببێت وەكو ئەو كەسەی كە (٤) كەس لە نەوەكانی پێغەمبەر** (إسماعيل عليه السلام) **لە كۆیلایەتی ئازاد كردبێت ئەوا (١٠) جار بڵێ :** (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِير) [البخاري : (٦٤٠٤) ، ومسلم : (٧٠٢٠)] .

**ئەگەر دەتەوێت (١٠٠٠) چاكەت بۆ بنووسرێت ، وە (١٠٠٠) خراپەیشت لەسەر بسڕێتەوە ، ئەوا (١٠٠) جار بڵێ :** (سُبْحَانَ اللَّه) [مسلم : (٧٠٢٧)] .

---

* **قەرزی لەسەر دابشكێنە : واتە هەندێك یان هەموو پارە قەرزەكەی لەسەر هەڵبگرە .**

❁ ئەگەر دەتەوێت ماڵێکت لە بەهەشتدا بۆ دروست بکرێت ئەوا هەموو ڕۆژێك (١٢) ركعات نوێژی سوننەت جگە لە فەرز بۆ خوا بکە [مسلم : (٧٢٨)] .

❁ ئەگەر لە شوێنێکدا دابەزیت و ویستت هیچ شتێك زەرەر و زیانت پێنەگەیەنێت تاوەکو لەو شوێنە دەڕۆیت ئەوا بڵێ : (أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ) [مسلم : (٢٧٠٨)] .

❁ ئەگەر دەتەوێت خوا پەنات بدات لە جنۆکە و شەیتانەکان لە بەیانیەوە تاوەکو ئێوارە ، وە لە ئێوارەوە تاوەکو بەیانی ئەوا لە بەیانیان و ئێواراندا (آية الكُرسي) بخوێنە [صحيح الترغيب والترهيب للألباني : (٦٦٢)] .

## فەزڵ و گەورەیی وتنی (بِسمِ الله) لە پێش جووتبوون

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْتِيَ أَهْلَهُ فَقَالَ : **بِسْمِ اللَّهِ ، اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا** ، فَإِنَّهُ إِنْ يُقَدَّرْ بَيْنَهُمَا وَلَدٌ فِي ذَلِكَ لَمْ يَضُرَّهُ شَيْطَانٌ أَبَدَاً))[1].

واتە : ئەگەر یەکێك لە ئێوە ویستی بچێتە لای خێزانەکەی و بڵێت : (بە ناوی خواوە ، خوایە بە دوورمان گرە لە شەیتان و شەیتانیش دوور بخەرەوە لەوەی

[1] صحيح البخاري : (٧٣٩٦) ، [يَأْتِيَ أَهْلَهُ : أي يُجامع زوجته] .

كه پێـمــان دەبەخشيــت) ئەنــجا ئەگــەر خـوا داينابــێ كــەوا لــەو جوتبوونـەوە منداڵيان ببێت ئەوا هەرگيز هيچ شەيتانێك زەرەر و زيان بەو منداڵە ناگەيەنێت .

## فەزڵ و گەورەيى چوار وتەكە

## (سُبْحَانَ اللَّه ، الْحَمْدُ لِلَّه ، اللَّهُ أَكْبَر ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّه)

عَنْ أُمِّ هَانِئٍ بِنْتِ أَبِي طَالِبٍ (رضي الله عنها) قَالَتْ : مَرَّ بِي ذَاتَ يَوْمٍ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) فَقُلْتُ : يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي قَدْ كَبِرْتُ وَضَعُفْتُ – أَوْ كَمَا قَالَتْ – فَمُرْنِي بِعَمَلٍ أَعْمَلُهُ وَأَنَا جَالِسَةٌ .

قَالَ :

١ . سَبِّحِي اللَّهَ مِائَةَ تَسْبِيحَةٍ فَإِنَّهَا تَعْدِلُ لَكِ مِائَةَ رَقَبَةٍ تُعْتِقِينَهَا مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ .

٢ . وَاحْمَدِي اللَّهَ مِائَةَ تَحْمِيدَةٍ فَإِنَّهَا تَعْدِلُ لَكِ مِائَةَ فَرَسٍ مُسْرَجَةٍ مُلْجَمَةٍ تَحْمِلِينَ عَلَيْهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ .

٣ . وَكَبِّرِي اللَّهَ مِائَةَ تَكْبِيرَةٍ فَإِنَّهَا تَعْدِلُ لَكِ مِائَةَ بَدَنَةٍ مُقَلَّدَةٍ مُتَقَبَّلَةٍ .

٤ . وَهَلِّلِي اللَّهَ مِائَةَ تَهْلِيلَةٍ – قَالَ ابْنُ خَلَفٍ أَحْسِبُهُ قَالَ – تَمْلأُ مَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ .

وَلاَ يُرْفَعُ يَوْمَئِذٍ لأَحَدٍ عَمَلٌ إِلاَّ أَنْ يَأْتِيَ بِمِثْلِ مَا أَتَيْتِ بِهِ))[١].

واتە : لە (أُمُّ هَانِئٍ)ی کچی (أَبُو طَالِب)ەوە فەرموویەتی : ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەلامدا تێپەڕ بوو منیش وتم : ئەی پێغەمبەری خوا بەڕاستی من گەورە بووم و لاواز بووم بۆیە فەرمانم پێبکە بە کردەوەیەك کە بەدانیشتنەوە بیکەم .

فەرمووی :

١ ـ (١٠٠) جار تەسبیحاتی خوا بکە و بڵێ : (سُبْحَانَ اللَّهِ) ئەوە بۆ تۆ بەرامبەر ئازاد کردنی (١٠٠) کۆیلە وایە لە نەوەکانی پێغەمبەر (إسماعيل عليه السلام) .

٢ ـ وە (١٠٠) جار سوپاس و ستایشی خوا بکە و بڵێ : (الْحَمْدُ لِلَّهِ) ئەوە بۆ تۆ بەرامبەر سەد (١٠٠) ئەسپ و ماینی زێن و لغاوکراو وایە کە بۆ جیهاد و تێکۆشان لە پێناوی خوادا خەڵکیان سەربخەیت و بەڕێ بکرێن بۆ جیهاد .

٣ ـ وە (١٠٠) جار گەورەیی خوا دەربڕە و بڵێ : (اللَّهُ أَكْبَرُ) ئەوە بۆ تۆ بەرامبەر سەد (١٠٠) وشتری دەستنیشانکراوی وەرگیراو وەکو دیاری بۆ ماڵی خوا وایە .

---

[١] قال المنذري رواه أحمد بإسناد حسن : (٢٥٦٧٥) ، وحسَّن إسناده الألباني في السلسلة الصحيحة : (١٣١٦) وفي صحيح الترغيب : (١٥٥٣) .

٤ ـ وە (١٠٠) جار یەکخواپەرستی بۆ خوا دەربڕە و بڵێ : (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّه) ئەوە نێوان ئاسمان و زەوی پڕدەکاتەوە .

وە لەو ڕۆژەدا بۆ هیچ یەکێك کردەوەیەك بەرز ناکرێتەوە باشتر بێت لەوە ئیللا مەگەر یەکێك بێت کە نموونەی ئەوەی تۆی کردبێت .

## فەزڵ و گەورەیی

## قورئان خوێندن و تێڕامان تێیدا و کردەوە پێکردنی

خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴿٢٤﴾ ﴾ [محمد] .

واتە : ئایا بۆ تێڕانامێنن و تێنافکرێن لە قورئان یان دڵەکانیان قوفڵی لێدراوە و داخراوە ؟

وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((مَنْ قَرَأَ حَرْفاً مِنْ كِتَابِ اللَّهِ فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ ، وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا ، لاَ أَقُولُ : ﴿الٓمٓ﴾ حَرْفٌ ، وَلَكِنْ أَلِفٌ حَرْفٌ ، وَلاَمٌ حَرْفٌ ، وَمِيمٌ حَرْفٌ))[1].

واتە : هەركەسێك پیتێك لە قورئان بخوێنێتەوە ئەوا بە خوێندنەوەی تەنها ئەو پیتە چاكەیەكی بۆ هەیە ، وە چاكەش یەك بە دەیە ، ناڵێم : ﴿الٓمٓ﴾ پیتێكە ، بەڵكو (أَلِفْ) پیتێكە و (لاَم)یش پیتێكە و (مِیم)یش پیتێكە .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) بە صەحابەكانی فەرمووە : ((أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَقْرَأَ ثُلُثَ الْقُرْآنِ فِي لَيْلَةٍ ؟ فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ وَقَالُوا : أَيُّنَا يُطِيقُ ذَلِكَ [يَا رَسُولَ اللَّهِ] ؟ فَقَالَ : يَقْرَأُ : ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ فَهِيَ تَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ))[2].

واتە : ئایا یەكێك لە ئێوە بێتوانا و دەستەوەستان دەبێت لەوەی كە لە شەوێكدا یەك لەسەر سێی قورئان بخوێنێت ؟

---

[1] الترمذي : (٢٩١٢) وصححه الألباني .

[2] صحيح البخاري : (٥٠١٥) ، وصحيح مسلم : (١٨٨٣) ، ومسند أبي يعلى الموصلي : (١٠١٩) واللفظ له ، وما بين المعقوفتين للبخاري .

ئەمه قورس و نارەحەت بوو لەسەریان و وتیان : كێ لـه ئێمـه توانـای ئـەوەی هەیه ئەی پێغەمبەری خوا ؟

فــەرمووی : ﴿ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَـدٌ ﴾ دەخوێنێـت ئەمـه هاوتـای یـەك لەســەر سێ‌ی قورئانه .

## خۆشەویسترین وته به لای خواوه

عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ (رضي الله عنه) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : ((أَحَبُّ الْكَلاَمِ إِلَى اللَّهِ أَرْبَعٌ : سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْـدُ لِلَّهِ وَلاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْـبَرُ ، لاَ يَضُـرُّكَ بِأَيِّهِـنَّ بَـدَأْتَ)) [مسـلم : (٥٧٢٤)] .

واته : خۆشەویسترین وته به لای خواوه چوار وتەیـه : (سُبْحَانَ اللَّه ، وَالْحَمْدُ لِلَّه ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّه ، وَاللَّهُ أَكْبَر) ، بـه هــەر كامێكیــان دەســت پێبكـەیت ئـەوه زیانـت پێناگەیەنێت .

## فەزڵ و گەورەیی زیکری خوا

**پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی :** ((أَلاَ أُنَبِّئُكُمْ بِخَيْرِ أَعْمَالِكُمْ ، وَأَزْكَاهَا عِنْدَ مَلِيكِكُمْ ، وَأَرْفَعِهَا فِي دَرَجَاتِكُمْ ، وَخَيْرٌ لَكُمْ مِنْ إِنْفَاقِ الذَّهَبِ وَالْوَرِقِ ، وَخَيْرٌ لَكُمْ مِنْ أَنْ تَلْقَوْا عَدُوَّكُمْ فَتَضْرِبُوا أَعْنَاقَهُمْ وَيَضْرِبُوا أَعْنَاقَكُمْ ؟ قَالُوا : بَلَى ، قَالَ : ذِكْرُ اللَّهِ تَعَالَى))[1].

**واتە : ئایا هەواڵتان پێبدەم بە باشترین و پاکترین کردەوەتان لای خاوەنەکەتان و لە هەمووی زیاتر پلەوپایەتان بەرز بکاتەوە و چاکتر بێت بۆتان لە بەخشینەوەی زێڕ و زیو ، وە باشتر بێت بۆتان لەوەی کە بگەن بە دووژمنەکەتان و بدەن لە گەردنیان و ئەوانیش بدەن لە گەردنتان ؟ وتیان : بەڵێ ، فەرمووی : زیکری خوای گەورە .**

**هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی :** ((لاَ يَقْعُدُ قَوْمٌ يَذْكُرُونَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ إِلاَّ حَفَّتْهُمُ الْمَلاَئِكَةُ ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ ، وَنَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ ، وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ)) [مسلم : (٢٧٠٠)] .

**واتە : هیچ کۆمەڵە کەسێك نییە کۆببنەوە و دانیشن زیکری خوای گەورە بکەن ئیللا فریشتەکان دەوریان دەگرن و ڕەحمەتی خوا دەیانگرێتەوە و ئارامی دادەبەزێتە سەر سەریان و خوای گەورە باسیان دەکات لای ئەوانەی کە لە لای خۆیدان .**

---

[1] الترمذي : (٣٣٧٧) ، وابن ماجه : (٣٠٧٢) ، وصححه الألباني ، الْوَرِق : أي الفضة .

**هـــەروەها پێغەمبـــەر (ﷺ) فەرموویـــەتی :** ((كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ ، ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ ، حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ : سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ ، سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ)) [البخاري : (٦١٨٨) ، ومسلم : (٢٦٩٤)] .

**واتە : دوو وتە هەیە سووکن لەسەر زمان ، قورسن لـە تـەرازووی چـاکەکان ، خۆشەویسـتن لـە لای خـوای ڕەحمـەت فـراوان :** (سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ ، سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ) .

## فەزڵ و گەورەیی داوای لێخۆشبوون

**خـــوای گـــەورە فەرموویـــەتی :** ﴿وَأَنِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ يُمَتِّعۡكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ﴿٣﴾﴾ [هود] .

**واتە : وە داوای لێخۆشـبوون لـە خـوای پـەروەردگارتان بکـەن و ئـەنجا تەوبـە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای لە پاداشتی ئەوەیشدا خوا ژیانێکی باشتان پێدەدات تا کاتێکی دیاریکراو کە مردنە .**

وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : ((وَاللَّهِ إِنِّي لَأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ فِي الْيَوْمِ أَكْثَرَ مِنْ سَبْعِينَ مَرَّةً)) [البخاري : (٦٣٠٧)] ، وفي رواية : ((مِائَةَ مَرَّةٍ)) [صحيح سنن ابن ماجه : (٣٨١٥)] .

**واتــە : ســوێند بــە خــوا مـن لـە ڕۆژێکـدا زیـاتر لـە حـەفتا (٧٠) جـار [وە لـە ریوایـەتێکی تـردا : سـەد (١٠٠) جـار] داوای لــێخۆشبوون لــە خــوا دەکــەم و تەوبەی لەلادەکەم و بۆ لای دەگەڕێمەوە و پەشیمانی بۆ دەردەبڕم .**

وَعَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (رضي الله عنه) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : ((مَنْ اسْتَغْفَرَ لِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ كَتَبَ اللَّهُ لَهُ بِكُلِّ مُؤْمِنٍ وَمُؤْمِنَةٍ حَسَنَةً))[1].

**واته : هەرکەسێك داوای لێخۆشبوون بکات بـۆ پیـاوانی ئیمانـدار و ئافرەتـانی ئیماندار ئەوا خوای گەورە لە بەرامبـەر هـەر پیـاوێکی ئیمانـدار و هـەر ئـافرەتێکی ئیمانداردا چاکە و حەسەنەیەکی بۆ دەنووسێت .**

**هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی :** ((سَيِّدُ الاِسْتِغْفَارِ أَنْ يَقُولَ الْعَبْدُ : اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي ، فَاغْفِرْ لِي ، فَإِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ ، مَنْ قَالَهَا حِينَ يُصْبِحُ مُوقِنًا بِهَا فَمَاتَ مِنْ يَوْمِهِ قَبْلَ أَنْ يُمْسِيَ فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ ، وَمَنْ قَالَهَا حِينَ يُمْسِي مُوقِنًا بِهَا فَمَاتَ مِنْ لَيْلَتِهِ قَبْلَ أَنْ يُصْبِحَ فَهْوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ)) [البخاري : (٦٣٠٦) بلفظ مقارب] .

**واته : سەروەری داوای لێخۆشبوونەکان ئەوەیە کە بەندە بڵێت : (خوایـە تـۆ پەروەردگاری منیت ، هیچ پەرستراوێك نی‌یە شایستەی پەرستن بێت جگە**

---

[1] الترمذي : (٣٣٧٧) ، وابن ماجه : (٣٠٧٢) ، وصححه الألباني ، الْوَرِق : أي الفضة .

**لە تۆ ، پەنات پێدەگرم لە خراپەی ئەوەی کە کردوومە ، بۆ تۆ داندەنێم بە ناز و نیعمەتەکانت بەسەرمەوە ، وە بۆ تۆ داندەنێم بە تاوانەکانم ، بۆیە لێمخۆشببە ، چونکە بەڕاستی هیچ کەسێك نی‌یە لە تاوانەکان خۆشببێت جگە لە تۆ)** ، هەرکەسێك بەیانیان ئەمە بڵێت و باوەڕی تەواوی پێی هەبێت و دڵنیا بێت پاشان لەو ڕۆژەیدا پێش ئەوەی ئێوارەی بەسەردا بێت بمرێت ئەوا ئەو کەسە لە خەڵکی بەهەشتە ، وە هەرکەسێکیش ئێواران ئەمە بڵێت و باوەڕی تەواوی پێی هەبێت و دڵنیا بێت پاشان لەو شەوەیدا پێش ئەوەی بەیانی بەسەردا بێت بمرێت ئەوا ئەو کەسە لە خەڵکی بەهەشتە .

## زیکری چەند هەندە

عَنْ جُوَيْرِيَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (رضي الله عنها) أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) خَرَجَ مِنْ عِنْدِهَا بُكْرَةً حِينَ صَلَّى الصُّبْحَ وَهِيَ فِي مَسْجِدِهَا ثُمَّ رَجَعَ بَعْدَ أَنْ أَضْحَى وَهِيَ جَالِسَةٌ فَقَالَ : مَا زِلْتِ عَلَى الْحَالِ الَّتِي فَارَقْتُكِ عَلَيْهَا ؟ قَالَتْ : نَعَمْ .

قَالَ النَّبِيُّ (ﷺ) : لَقَدْ قُلْتُ بَعْدَكِ أَرْبَعَ كَلِمَاتٍ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ لَوْ وُزِنَتْ بِمَا قُلْتِ مُنْذُ الْيَوْمِ لَوَزَنَتْهُنَّ : **سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ عَدَدَ خَلْقِهِ وَرِضَا نَفْسِهِ وَزِنَةَ عَرْشِهِ وَمِدَادَ كَلِمَاتِهِ))** [مسلم : (٧٠٨٨)] .

واتە : لە (جُوَيْرِيَة)ی دایکی ئیماندارانەوە (رضي الله عنها) پێغەمبەر (ﷺ) لە بەرەبەیاندا لە پاش ئەوەی کە نوێژی بەیانی کرد لای ئەو ڕۆیشتە دەرەوە لە کاتێکدا کە ئەو لە شوێنی نوێژکردنەکەیدا دانیشتبوو پاشان لە دوای هاتنی کاتی چێشتەنگاو گەڕایەوە و ئەو هەر دانیشتبوو ، ئەوە بوو فەرمووی : ئایا تاوەکو ئێستا بەردەوام

لەسەر ئەو حاڵەیت کە من لێت جیابوومەوە لەسەری ؟

وتی : بەڵێ .

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی : بەڕاستی من لە پاش تۆ چوار وتەم سێ جار وتووە ئەگەر کێشانە بکرێت بەوەی کە تۆ لە ماوەی ئەمڕۆدا وتووەتە ئەوا لەوەی تۆ سەنگی قورسترە : (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ عَدَدَ خَلْقِهِ وَرِضَا نَفْسِهِ وَزِنَةَ عَرْشِهِ وَمِدَادَ كَلِمَاتِهِ) واتە : پاکی و دووری بۆ خوا لە هەموو کەم و کوڕی و عەیبەیەك وە سوپاس و ستایش بۆ خوا لەسەر تەواوی و گەورەیی و جوانی و بەرزی ناو و سیفەتەکانی و فراوانی و زۆری ناز و نیعمەتەکانی : بە ژمارەی دروستکراوەکانی و جێی ڕەزامەندی خوا و بە کێش و قورسی عەرشی خۆی و بە ئەندازەی فراوانی و زۆری وتەکانی .

**هــەروەها پێغەمبــەر (ﷺ) فەرموویــەتی :** ((أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَكْسِبَ كُلَّ يَوْمٍ أَلْفَ حَسَنَةٍ ؟ فَسَأَلَهُ سَائِلٌ مِنْ جُلَسَائِهِ : كَيْفَ يَكْسِبُ أَحَدُنَا أَلْفَ حَسَنَةٍ ؟ قَالَ : يُسَبِّحُ مِائَةَ تَسْبِيحَةٍ فَيُكْتَبُ لَهُ أَلْفُ حَسَنَةٍ أَوْ يُحَطُّ عَنْهُ أَلْفُ خَطِيئَةٍ)) [مسلم : (٢٦٩٨)] .

**واتە : ئایا یەکێك لە ئێوە بێتوانا و دەستەوەستان دەبێت لـەوەی کـە هـەموو ڕۆژێك هەزار (١٠٠٠) چاکە و حەسەنە بە دەست بخات ؟**

**پرسیارکارێك لەوانەی کە لەگەڵیدا دانیشتبوون پرسـیاری لــێ کـرد : چـۆن هەزار (١٠٠٠) چاکە و حەسەنە بە دەست بخات ؟**

**فەرمووی : بەوەی کە (١٠٠) جار تەسبیحاتی خوا بکـات و بڵێـت :** (سُبْحَانَ اللَّه) ، **بــەوە هــەزار (١٠٠٠) چــاکە و حەســەنەی بــۆ دەنووســرێت یــان هــەزار (١٠٠٠) خراپە و هەڵەی لەسەر لادەبرێت .**

## سوننەتێتی دوو رکعات لە پاش دەستنوێژ

**پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی :** ((يَا بِلاَلُ أَخْبِرْنِي بِأَرْجَى عَمَلٍ عَمِلْتَهُ فِي الإِسْلاَمِ ، فَإِنِّي سَمِعْتُ دَفَّ نَعْلَيْكَ بَيْنَ يَدَيَّ فِي الْجَنَّةِ ؟

قَالَ : مَا عَمِلْتُ عَمَلاً أَرْجَى عِنْدِي : مِنْ أَنِّي لَمْ أَتَطَهَّرْ طُهُورًا فِي سَاعَةٍ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ إِلاَّ صَلَّيْتُ بِذَلِكَ الطُّهُورِ مَا كُتِبَ لِي أَنْ أُصَلِّيَ)) [البخاري : (١١٤٩) ، ومسلم : (٢٤٥٨)] .

واته‌ : پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) له‌ كاتی نوێژی به‌یانیدا به‌ بیلالی فه‌رموو : ئه‌ی بیلال هه‌واڵم بده‌رێ به‌ كرده‌وه‌یه‌ك كه‌ له‌ هه‌موو كرده‌وه‌كانت زیاتر ئومێدت پێی هه‌بێت كه‌وا له‌ ئیسلامدا ئه‌نجامتداون ، چونكه‌ من گوێم له‌ جوڵاندنه‌وه‌ی پێڵاوه‌كانت بوو له‌ پێشه‌وه‌م له‌ نێو به‌هه‌شتدا ؟ ئه‌ویش فه‌رمووی : هیچ كرده‌وه‌یه‌كم نه‌كردووه‌ زیاتر ئومێدم پێی هه‌بێت به‌ لای خۆمه‌وه‌ : ئه‌وه‌ نه‌بێت كه‌وا له‌ هه‌ر كاتێكدا له‌ شه‌ودا بووبێت یان له‌ ڕۆژدا ده‌ستنوێژم گرتبێت ئیللا به‌و ده‌ستنوێژه‌وه‌ چه‌ندێك بۆم نووسرابێت نوێژم كردووه‌ .

## فه‌زڵ و گه‌وره‌یی به‌ ڕۆژووبوونی سێ ڕۆژ له‌ هه‌موو مانگێكدا و نوێژی ویتر و دوو ركعاته‌كه‌ی چێشته‌نگاو

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ : ((أَوْصَانِي خَلِيلِي (ﷺ) بِثَلاَثٍ : صِيَامِ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ، وَرَكْعَتَيِ الضُّحَى ، وَأَنْ أُوتِرَ قَبْلَ أَنْ أَنَامَ)) [البخاري : (١٩٨١)] .

واته‌ : هه‌ره‌خۆشه‌ویسته‌كه‌م (ﷺ) ئامۆژگاری و وه‌سێتی پێكردووم به‌ سێ شت : به‌ڕۆژووبوونی سێ ڕۆژ له‌ هه‌موو مانگێكدا ، وه‌ دوو ركاتی چێشته‌نگاو (زوحا) ، وه‌ نوێژی ویتر بكه‌م پێش ئه‌وه‌ی بخه‌وم .

## فەزڵ و گەورەیی

### فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە

پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : ((مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ وَذَلِكَ أَضْعَفُ الإِيمَانِ)) [مسلم : (٧٠)] .

**واتە : هەرکەسێك لە ئێوە تاوان و خراپەیەکی بینی ئەوا با بە دەستی بیگۆڕێت ، وە ئەگەر نەیتوانی ئەوا با بە زمانی بیگۆڕێت ، وە ئەگەر نەیتوانی ئەوا با بە دڵی بیگۆڕێت و ئەوەیش لاوازترینی ئیمانە .**

### پاداشتی صەبر و ئارام گرتن لەسەر پەروەردەکردنی کچان

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((مَنْ كَانَ لَهُ ثَلاَثُ بَنَاتٍ ، فَصَبَرَ عَلَيْهِنَّ وَأَطْعَمَهُنَّ وَسَقَاهُنَّ وَكَسَاهُنَّ مِنْ جِدَتِهِ كُنَّ لَهُ حِجَاباً مِنَ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ))[1].

**واتە : هەر کەسێك سێ کچی هەبێت و ئارامیان لە سەر بگرێت و خواردن و خواردنەوە و جل و بەرگیان بۆ دابین بکات بە هەوڵ و توانای خۆی : ئەوا ئەو سێ کچە دەبنە بەربەسێتك بۆی و دەیپارێزن لە ئاگری دۆزەخ لە ڕۆژی قیامەتدا .**

---

[1] ابن ماجه : (٣٦٦٩) ، وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة : (٢٩٤) ، مِنْ جِدَتِهِ : أي من سعته .

**هه‌روه‌ها پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رموویه‌تی :** ((مَنْ عَالَ جَارِيَتَيْنِ حَتَّى تَبْلُغَا ، دَخَلْتُ أَنَا وَهُوَ الْجَنَّةَ كَهَاتَيْنِ وَأَشَارَ بِأُصْبُعَيْهِ السَّبَّابَةِ وَالَّتِي تَلِيهَا))(٢).

**واته : هه‌ر كه‌سێك دوو كچ به‌خێو بكات تاوه‌كو پێده‌گه‌ن و بالّغ ده‌بن ئه‌وا من و ئه‌و پێكه‌وه ده‌چینه به‌هه‌شته‌وه وه‌كو ئه‌مه و ئاماژه‌ی كرد بۆ په‌نجه‌ی شایه‌تومان و په‌نجه‌ی ناوه‌ڕاستی .**

## پاداشتی صه‌بر و ئارام گرتن

## له‌سه‌ر موسیبه‌ت و ناهه‌مواریه‌كان و مردنی كه‌سێك

**پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رموویه‌تی :** ((مَا مِنْ عَبْدٍ تُصِيبُهُ مُصِيبَةٌ فَيَقُولُ : "إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ، اللَّهُمَّ أْجُرْنِي فِي مُصِيبَتِي وَأَخْلِفْ لِي خَيْرًا مِنْهَا" إِلاَّ أَجَرَهُ اللَّهُ فِي مُصِيبَتِهِ وَأَخْلَفَ لَهُ خَيْرًا مِنْهَا)) [مسلم : (٢١٦٦)] .

**واته : هیچ عه‌بدێك نی‌یه كاره‌سات و موسیبه‌تێكی تووش ببێت و بڵێت : (إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ ، اللَّهُمَّ أْجُرْنِي فِي مُصِيبَتِي وَأَخْلِفْ لِي خَيْرًا مِنْهَا) واته : "ئێمه هی خواین و ئێمه‌یش بۆ لای ئه‌و ده‌گه‌ڕێینه‌وه ، خوایه پاداشتم بده‌ره‌وه له‌سه‌ر ئه‌م موسیبه‌ته‌م و شوێنه‌كه‌یم بۆ پڕبكه‌ره‌وه به له‌وه باشتر" ، هیچ عه‌بدێك نی‌یه ئه‌مه**

---

(٢) صحيح مسلم : (٢٦٣١) ، جَارِيَتَيْنِ : أي : بنتين .

بلێت ئیللا خوا پاداشتی دەداتەوە لەسەر موسیبەتەكەیی و شوێنەكەیی بۆ پڕ دەكاتەوە بە لەوە باشتر .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : خوای گەورە فەرموویەتی : ((مَا لِعَبْدِي الْمُؤْمِنِ عِنْدِي جَزَاءٌ إِذَا قَبَضْتُ صَفِيَّهُ مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا ثُمَّ احْتَسَبَهُ إِلاَّ الْجَنَّةُ)) [البخاري : (٥٩٤٤)] .

واتە : عەبدە ئیماندارەكەم هیچ پاداشتێكی نییە لای من كاتێك كە روحی خۆشەویستەكەی دەكێشم لە خەڵكی دونیا ئەنجا چاوەڕێی پاداشتی ئەوە بكات ئیللا بەهەشت نەبێت .

## فەزڵ و گەورەیی

## بەڕۆژووبوونی ڕۆژی عەرەفە و ڕۆژی عاشورا

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((صِيَامُ يَوْمِ عَرَفَةَ أَحْتَسِبُ عَلَى اللَّهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ وَالسَّنَةَ الَّتِي بَعْدَهُ ، وَصِيَامُ يَوْمِ عَاشُورَاءَ أَحْتَسِبُ عَلَى اللَّهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ)) [مسلم : (٢٨٠٣)] .

واتــه : بــەڕۆژووبوونی ڕۆژی عەرەفــە* چــاوەڕێم لای خــوا کــە بیکاتــە مایــەی سـڕینەوەی تاوانــەکانی ئــەو ســاڵەی پــێش خــۆی و ئــەو ســاڵەی پــاش خــۆی ، وە بــەڕۆژووبوونی ڕۆژی عاشــورا چــاوەڕێم لای خــوا کــە بیکاتــە مایــەی ســڕینەوەی تاوانەکانی ئەو ساڵەی پێش خۆی .

## فەزڵ و گەورەیی کۆکردنەوەی نێوان بە ڕۆژووبوون و شوێنکەوتنی جەنازە و خواردندان و بەسەرکردنەوەی نەخۆش

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) : ((مَنْ أَصْبَحَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ صَائِمًا ؟ قَالَ أَبُو بَكْرٍ (رضي الله عنه) : أَنَا .

قَالَ : فَمَنْ تَبِعَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ جَنَازَةً ؟ قَالَ أَبُو بَكْرٍ (رضي الله عنه) : أَنَا .

قَالَ : فَمَنْ أَطْعَمَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ مِسْكِينًا ؟ قَالَ أَبُو بَكْرٍ (رضي الله عنه) : أَنَا .

قَالَ : فَمَنْ عَادَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ مَرِيضًا ؟ قَالَ أَبُو بَكْرٍ (رضي الله عنه) : أَنَا .

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) : مَا اجْتَمَعْنَ فِي امْرِئٍ إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ)) [مسلم : (١٠٢٨)] .

واته : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی :

---

* بەڕۆژووبوونی ڕۆژی عەرەفە بۆ جگە لە ئەو کەسانەیە کە لە (حەج)دان .

١ ـ كێ لە ئێوە ئەمڕۆ ڕۆژی لێبووەتەوە و **بەڕۆژوو بووە** ؟

ئەبو بەكر (رضي الله عنه) وتی : من .

٢ ـ فەرمووی : ئەی كێ لە ئێوە ئەمڕۆ **شوێنی جەنازەیەك كەوتووە** ؟

ئەبو بەكر (رضي الله عنه) وتی : من .

٣ ـ فەرمووی : ئەی كێ لە ئێوە ئەمڕۆ **خواردنی داوە بە فەقیر و هەژارێك**؟

ئەبو بەكر (رضي الله عنه) وتی : من .

٤ ـ فەرمووی : ئەی كێ لە ئێوە ئەمڕۆ **نەخۆشێكی بەسەركردووەتەوە** ؟

ئەبو بەكر (رضي الله عنه) وتی : من .

پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی : **ئەمانە لە هیچ كەسێكدا كۆنابنەوە ئیللا دەچێتە بەهەشتەوە** .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا دەفەرمووێت : ((يَا ابْنَ آدَمَ مَرِضْتُ فَلَمْ تَعُدْنِي ، قَالَ : يَا رَبِّ كَيْفَ أَعُودُكَ وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ ؟

قَالَ : أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ عَبْدِي فُلاَنًا مَرِضَ فَلَمْ تَعُدْهُ أَمَا عَلِمْتَ أَنَّكَ لَوْ عُدْتَهُ لَوَجَدْتَنِي عِنْدَهُ .

يَا ابْنَ آدَمَ اسْتَطْعَمْتُكَ فَلَمْ تُطْعِمْنِي ، قَالَ : يَا رَبِّ وَكَيْفَ أُطْعِمُكَ وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ؟

قَالَ : أَمَا عَلِمْتَ أَنَّهُ اسْتَطْعَمَكَ عَبْدِي فُلاَنٌ فَلَمْ تُطْعِمْهُ أَمَا عَلِمْتَ أَنَّكَ لَوْ أَطْعَمْتَهُ لَوَجَدْتَ ذَلِكَ عِنْدِي .

يَا ابْنَ آدَمَ اسْتَسْقَيْتُكَ فَلَمْ تَسْقِنِي ؟ قَالَ : يَا رَبِّ كَيْفَ أَسْقِيكَ وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ ؟

قَالَ : اسْتَسْقَاكَ عَبْدِي فُلاَنٌ فَلَمْ تَسْقِهِ أَمَا إِنَّكَ لَوْ سَقَيْتَهُ وَجَدْتَ ذَلِكَ عِنْدِي)) [مسلم : (٢٥٦٩)] .

**واته : خوای گه‌وره له ڕۆژی قیامه‌تدا ده‌فه‌رمووێت :**

**١ ـ ئه‌ی ئاده‌میزاد نه‌خۆشكه‌وتم و تۆیش به‌سه‌رمت نه‌كرده‌وه ؟**

**ئه‌ویش ده‌ڵێت : ئه‌ی په‌روه‌ردگار چۆن تۆ به‌سه‌ربكه‌مه‌وه له كاتێكدا كه تۆ په‌روه‌ردگاری هه‌موو جیهانیانیت .**

**فه‌رمووی : ئایا نه‌تزانی كه فلانه عه‌بدم نه‌خۆشكه‌وت و تۆیش به‌سه‌رت نه‌كرده‌وه ؟ ئایا نه‌تزانی كه ئه‌گه‌ر تۆ به‌سه‌رت بكردایه‌ته‌وه ئه‌وا منت لای ئه‌و ده‌بینی .**

۲ ـ ئەی ئادەمیزاد داوای خواردنم لێت کرد و تۆیش خواردنت پێنەدام ؟

ئەویش دەڵێت : ئەی پەروەردگار چۆن خواردن بە تۆ بدەم لە کاتێکدا کە تۆ پەروەردگاری هەموو جیهانیانیت .

فەرمووی : ئایا نەتزانی کە فڵانە عەبدم داوای خواردنی لێت کرد و تۆیش خواردنت پێی نەدا ؟ ئایا نەتزانی کە ئەگەر تۆ خواردنت پێی بدایەت ئەوا منت لای ئەو دەبینی .

۳ ـ ئەی ئادەمیزاد داوای خواردنەوەم لێت کرد و تۆیش خواردنەوەت پێنەدام؟

ئەویش دەڵێت : ئەی پەروەردگار خواردنەوە بە تۆ بدەم لە کاتێکدا کە تۆ پەروەردگاری هەموو جیهانیانیت .

فەرمووی : فڵانە عەبدم داوای خواردنەوەی لێت کرد و تۆیش خواردنەوەت پێی نەدا ، ئەگەر تۆ خواردنەوەت پێی بدایەت ئەوا منت لای ئەو دەبینی .

## گەورەیی و قورسی حەرامێتی ریـــبا

عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) قَالَ : ((لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) آكِلَ الرِّبَا وَمُوكِلَهُ وَكَاتِبَهُ وَشَاهِدَيْهِ ، وَقَالَ : هُمْ سَوَاءٌ)) [مسلم : (٤٠٦٩)] .

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەعنەتی کردووە لەو کەسەی کە :

١ / ریبا دەخوات : (آكِلَ الرِّبَا) .

٢ / وە ئەوەیش کە ریبا دەدات بە دەرخواردی ریبا خۆرەکەدا : (مُوكِلَهُ) .

٣ / وە ئەوەیش کە گرێبەستی (عەقد)ی ریباکە دەنووسێت : (كَاتِبَهُ) .

٤ / وە ئەو دوو شایەتەیش کە شایەتی دەدەن لەسەر گرێبەستی (عەقد)ی ریباکە لە نێوان ریبا خۆر و ئەوەی دەیدات بە دەرخواردیا : (شَاهِدَيْهِ) .

وە فەرمووی : ئەمانە هەموویان لە تاوانی ریبادا یەکسانن .

## فەرمان کردن بە ڕیش هێشتنەوە

عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهما) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : ((انْهَكُوا* الشَّوَارِبَ ، وَأَعْفُوا اللِّحَى)) [البخاري : (٥٨٩٣)] .

واتە : سمێڵتان لابەرن و ڕیشتان وازلێبێنن و بیهێڵنەوە .

---

* انْهَكُوا : أي : أحفوا .

## قەدەغەكردنی پۆشاك شۆڕی

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ : ((مَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ مِنَ الإِزَارِ* فَفِي النَّارِ)) [البخاري : (٥٧٨٧)] .

**واتە : ئەوەی كە لە خوارووی هەردوو قوولەپێوە بێت لە پۆشاك ئەوە لە ئاگردایە .**

**هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی :** ((ثَلاَثَةٌ لاَ يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ، قَالَ : فَقَرَأَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) ثَلاَثَ مِرَارٍ .

قَالَ أَبُو ذَرٍّ : خَابُوا وَخَسِرُوا مَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ ؟

قَالَ : الْمُسْبِلُ وَالْمَنَّانُ** وَالْمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلِفِ الْكَاذِبِ)) [مسلم : (٣٠٦)] .

**واتە : سێ كەس هەن خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا قسەیان لەگەڵدا ناكات و سەیریان ناكات و پاكیان ناكاتەوە لە پیسی تاوانەكانیان و سزای بە ئێش و ئازاریان بۆ هەیە ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سێ جار ئەمەی خوێندەوە .**

---

* المقصود بالإزار : ما يلبسه الرجل كالثوب والسروال والبشت والبنطال .

**واتە : مەبەست بە (ئیزار) : ئەوەیە كە پیاو لە پێی دەكات لە پۆشاك و شەرواڵ و پانتۆڵ .**

** الْمَنَّانُ : الذي يذكر إحسانه مُمتنا به على من أحسن إليه .

**واتە مننەتكەر : ئەو كەسەیە كە چاكەكانی باس دەكات و مننەتی پێدەكات بەسەر ئەو كەسەوە كە چاكەی لەگەڵدا كردووە .**

(أَبُو ذَر) فه‌رمووی : بێبه‌شبوون له خێر و خه‌سارومه‌ندبوون كێن ئه‌وانه ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ؟

فه‌رمووی : ئه‌مانه‌ن :

١ ـ ئه‌و كه‌سه‌ی كه پۆشاكه‌كه‌ی شۆڕ ده‌كات .

٢ ـ وه ئه‌و كه‌سه‌یش كه چاكه‌كانی باس ده‌كات و منه‌تی پێده‌كات به‌سه‌ر ئه‌و كه‌سه‌وه كه چاكه‌ی له‌گه‌ڵدا كردووه .

٣ ـ وه ئه‌و كه‌سه‌یش كه شتومه‌ك و كاڵاكانی ڕه‌واج پێده‌دات و ده‌یانفرۆشێت به سوێندخواردنی درۆ .

## چاكه‌كردن له‌گه‌ڵ دراوسێدا به‌شێكه له ئیمان

پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رموویه‌تی : ((وَاللَّهِ لاَ يُؤْمِنُ ، وَاللَّهِ لاَ يُؤْمِنُ ، وَاللَّهِ لاَ يُؤْمِنُ ، قِيلَ : وَمَنْ يَا رَسُولَ اللَّهِ ؟

قَالَ : الَّذِي لاَ يَأْمَنُ جَارُهُ بَوَائِقَهُ)) [البخاري : (٥٥٥٧)] .

واته : سوێند به خوا ئیمانی نی‌یه ، سوێند به خوا ئیمانی نی‌یه ، سوێند به خوا ئیمانی نی‌یه ، وترا : كێیه ئه‌وه ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ؟

فەرمووی : ئەو کەسەیە کە دراوسێکەی ئەمین نیە لە زیان و زەرەرەکانی .

## فەزڵ و گەورەیی بە خێوکردنی یەتیم

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ فِي الْجَنَّةِ هَكَذَا ، وَأَشَارَ بِأُصْبُعَيْهِ السَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى)) [البخاري : (٥٥٤٦)] .

واتە : من و ئەو کەسەی کە سەرپەرشتی بەخێوکردنی یەتیم دەکات لە بەهەشتدا بەم شێوازەین و ئاماژەی کرد بە هەردوو پەنجەی شایەتومان و ناوەڕاستینەی .

## فەزڵ و گەورەیی بەدەمەوەڕۆیشتنی بێوەژن و فەقیر و هەژار

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((السَّاعِي عَلَى الأَرْمَلَةِ وَالْمِسْكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ، أَوِ الْقَائِمِ اللَّيْلَ الصَّائِمِ النَّهَارَ)) [البخاري : (٥٣٥٣) ، ومسلم : (٢٩٨٢)].

واتە : ئەو کەسەی کە بەدەم بێوەژن و فەقیر و هەژارەوەیە و یارمەتیان دەدات وەکو کەسێکە کە لە پێناوی خوادا جیهاد دەکات و تێدەکۆشێت یان وەکو کەسێکە کە بەردەوام لە شەودا شەونوێژ دەکات و لە ڕۆژیشدا بەڕۆژوو دەبێت .

## فەزڵ و گەورەیی

### چاوەڕێ كردنی پاداشتی دابین كردنی خەرجی و بژێوی خێزان

**پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی** : ((إِذَا أَنْفَقَ الرَّجُلُ عَلَى أَهْلِهِ يَحْتَسِبُهَا فَهُوَ لَهُ صَدَقَةٌ)) [البخاري : (٥٣)] .

**واتە : كاتێك كە پیاو پارەی خەرج كرد بۆ دابین كردنی خەرجی و بژێوی خێزانەكەی چاوەڕێی پاداشتی ئەوەی كرد ئەوە بۆی دەبێتە صەدەقە .**

### فەزڵ و گەورەیی گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ : سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) يَقُولُ : ((مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُبْسَطَ لَهُ فِي رِزْقِهِ وَأَنْ يُنْسَأَ* لَهُ فِي أَثَرِهِ فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ)) [البخاري : (٥٩٨٥)] .

**واتە : هەركەسێك پێی خۆشە فراوانی بخرێتە رزقیەوە و بەرەكەت بكەوێتە تەمەنیەوە ئەوا با پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنێت .**

وَعَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : ((الرَّحِمُ مُعَلَّقَةٌ بِالْعَرْشِ تَقُولُ : مَنْ وَصَلَنِي وَصَلَهُ اللَّهُ ، وَمَنْ قَطَعَنِي قَطَعَهُ اللَّهُ)) [مسلم : (١٧)] .

---

* يُنْسَأَ لَهُ فِي أَثَرِهِ : أي يؤخر في أجله وعُمُره .

**واتە : ماوەی ژیانی و تەمەنی دوا دەخرێت ، مەبەست ئەوەیە : بەرەكەت دەكەوێتە تەمەنیەوە .**

واته : خزمایه‌تی و ڕه‌حـم هه‌ڵواستراوه به عه‌رشـه‌وه و ده‌ڵێت :

هه‌ركه‌سـێك بمگه‌یـه‌نێت ئـه‌وا خـوا ده‌یگه‌یـه‌نێت بـه ڕه‌حـم و بـه‌زه‌یی خـۆی ، وه هه‌ركه‌سێكیش بمپچڕێنێت ئه‌وا خوا ڕه‌حم و به‌زه‌یی خۆیی لـێ ده‌پچڕێنێت .

هه‌روه‌ها پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رموویه‌تی : ((لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَاطِعُ رَحِمٍ)) [البخاري : (٥٩٨٤) ، ومسلم : (٢٥٥٦)] .

واته : ئه‌و كه‌سه ناچێته به‌هه‌شته‌وه كه په‌یوه‌ندی خزمایه‌تی ده‌پچڕێنێت .

## فه‌زڵ و گه‌وره‌یی چاكه‌كردن له‌گه‌ڵ باوك و دایكدا

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (ﷺ) قَالَ : ((سَأَلْتُ النَّبِيَّ (ﷺ) أَيُّ الْعَمَلِ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ ؟ قَالَ : الصَّلاَةُ عَلَى وَقْتِهَا ، قُلْتُ : ثُمَّ أَيٌّ ؟ قَالَ : **ثُمَّ بِرُّ الْوَالِدَيْنِ** ، قُلْتُ : ثُمَّ أَيٌّ ؟ قَالَ : الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ)) [البخاري : (٥٩٧٠)] .

واته : پرسیارم كرد لـه پێغه‌مبـه‌ر (ﷺ) و وتم : ئایـا خۆشه‌ویسـترین كـرده‌وه لای خوا كامه‌یه ؟

فه‌رمووی : نوێژكردن له كاتی خۆیدا .

وتم : ئه‌نجا چی تــر ؟

فه‌رمووی : ئه‌نجا چاكه‌كردن له‌گه‌ڵ باوك و دایكدا .

وتم : ئەنجا چی تـــر ؟

فەرمووی : جیهاد و تێكۆشان لە پێناوی خوادا .

## شووم و نەهامەتی

## دڵ پڕبوون لە یەكتر و دابڕانی نێوان موسڵمانان

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((تُفْتَحُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ يَوْمَ الاِثْنَيْنِ وَيَوْمَ الْخَمِيسِ فَيُغْفَرُ لِكُلِّ عَبْدٍ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا إِلاَّ رَجُلاً كَانَتْ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أَخِيهِ شَحْنَاءُ ، فَيُقَالُ : أَنْظِرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْ□لِحَا ، أَنْظِرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْ□لِحَا ، أَنْظِرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْ□لِحَا)) [مسلم : (٢٥٦٥)] .

واتـــه : دەرگاكـــانی بەهەشـــت لـــه ڕۆژی دوو شـــەمه و ڕۆژی پێـــنج شـــەمەدا دەكرێنـــەوە و خـــوا لـــه هـــەموو عەبـدێك كـه هـیچ شـتێكی نـەكردبێت بـه شـەریكی خۆشدەبێت ئیللا پیاوێك نەبێت كە لە نێوان خۆی و براكەیدا دڵ پڕبوون لـه یـەكتر و ڕقەبەرایەتی هـەبێت ، دەوترێـت : ئـەم دووانـە دوابخـەن تـاوەكو ڕێكدەكـەون و ئاشتدەبنەوە ، ئەم دووانـە دوابخـەن تـاوەكو ڕێكدەكـەون و ئاشـتدەبنەوە ، ئـەم دووانە دوابخەن تاوەكو ڕێكدەكەون و ئاشتدەبنەوە .

کەواتــە بـرام : تێڕامێنــە لــەم فەرموودەیــە و لێهـاتوو ببــە و دەستپێشـخەری ڕێککەوتن و ئاشتی بکە لەگەڵ براکەتدا ـ وە با سەربەرزی بە تاوان نەتگرێت ـ بۆ ئەوەی ئەجر و پاداشت ببەیتەوە و کردەوەکانت بەرز ببێتەوە بۆ لای خوا .

## فەزڵ و گەورەیی پاراستنی زمان و داوێن

عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رضي الله عنه) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ : ((مَنْ يَضْمَنْ لِي مَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ وَمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ أَضْمَنْ لَهُ الْجَنَّةَ)) [البخاري : (٥٩٩٣)] .

واتە : کێ پاراستنی ئەوەی نێـوان ئـەو دوو ئێسـکەیی کـە دانـەکانیان لەسـەر دەڕوێت و ئەوەی نێوان هەردوو ڕانیم بۆ مسۆگر دەکات تـاوەکو منـیش بەهەشـتی بۆ مسۆگر بکەم .

مەبەست ئەوەیە : کێ پاراستنی زمانی و داوێنـیم بـۆ مسـۆگر دەکـات تـاوەکو منیش بەهەشتی بۆ مسۆگر بکەم .

## حەرامێتی زوڵم و ستەم کردن

پێغەمبــەر (ﷺ) فەرموویــەتی : ((مَنْ كَانَتْ لَهُ مَظْلَمَةٌ لأَحَدٍ مِنْ عِرْضِهِ أَوْ شَيْءٍ فَلْيَتَحَلَّلْهُ مِنْهُ الْيَوْمَ قَبْلَ أَنْ لاَ يَكُونَ دِينَارٌ وَلاَ دِرْهَمٌ ، إِنْ كَانَ لَهُ عَمَلٌ صَالِحٌ أُخِذَ مِنْهُ

بِقَدْرِ مَظْلَمَتِهِ ، وَإِنْ لَمْ تَكُنْ لَهُ حَسَنَاتٌ أُخِذَ مِنْ سَيِّئَاتِ صَاحِبِهِ فَحُمِلَ عَلَيْهِ)) [البخاري : (٢٢٦٩)] .

واتە : هەرکەسێك زوڵم و ستەم لێکردنی کەسێکی لە لایە لە ناوبانگ لەکەدارکردنی یان هەر شتێك ئەوا با ئەمڕۆ گەردنی خۆیی پێئازاد بکات پێش ئەوەی کە ڕۆژێك بێت دینار و دیرهەمی تێدا نییە ، ئەگەر کردەوەی چاکەی ببێت ئەوا لێی دەبەن بە ئەندازەی ئەو زوڵم و ستەمەی کە لە لایەتی ، وە ئەگەر چاکە و حەسەناتیشی نەبێت ئەوا لە خراپەی هاوەڵەکەی دێنن و دەیخەنە سەر ئەم .

## حەرامێتی غەیبەت کردن و وریاکردنەوە لێی

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ : ((أَتَدْرُونَ مَا الْغِيبَة ؟ قَالُوا : اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَم ، قَالَ : ذِكْرُكَ أَخَاكَ بِمَا يَكْرَهُهُ ، قِيلَ : أَفَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ فِي أَخِي مَا أَقُول ؟ قَالَ : إِنْ كَانَ فِيهِ مَا تَقُولُ فَقَدْ اِغْتَبْتَهُ ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهِ فَقَدْ بَهَتَّهُ*)) [مسلم : (٢٥٦٥)] .

واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە صەحابەکانی فەرموو : ئایا دەزانن غەیبەت چی‌یە ؟ وتیان : خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن ، فەرمووی : (غەیبەت) ئەوەیە کە باسی براکەت بکەیت بەوەی کە پێی ناخۆش بێت ، وترا : ئەی ئەگەر ئەوەی کە دەیڵێم لە براکەمدا هەبێت ؟ فەرمووی : ئەگەر ئەوەی کە دەیڵێیت تێیدا هەبێت ئەوا غەیبەتیت کردووە ، وە ئەگەر تێیدا نەبێت ئەوا بوختیانت بۆی کردووە .

---

* (بَهَتَّهُ : أي افتريت عليه الكذب) واتە : درۆت لەسەری کردووە و ئەوەی کە وتووتە بۆیت هەڵواسیوە .

وَعَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (ﷺ) قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) : ((لَمَّا عَرَجَ بِي رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ مَرَرْتُ بِقَوْمٍ لَهُمْ أَظْفَارٌ مِنْ نُحَاسٍ يَخْمِشُونَ وُجُوهَهُمْ وَصُدُورَهُمْ ، فَقُلْتُ : مَنْ هَؤُلاَءِ يَا جِبْرِيلُ ؟ قَالَ : هَؤُلاَءِ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ لُحُومَ النَّاسِ وَيَقَعُونَ فِي أَعْرَاضِهِمْ))[1].

**واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : کاتێك کە خوای پەروەردگارم بەرزمی کردەوە بۆ سەرووی ئاسمانەکان بە لای خەڵکانێکدا تێپەڕبووم نینۆکیان هەبوو لە مس و روومەت و سنگی خۆیانیان پێدەڕوشاند و دەڕنی و بریندار دەکرد .**

**منیش وتم : ئەی جبریل ئەوانە کێن ؟**

**فەرمووی : ئەوانە ئەو کەسانەن کە گۆشتی خەڵکی دەخۆن و دەکەونە ناو باسکردنی سومعەت و ناوبانگیان بە خراپە [واتە : غەیبەت و زەمی خەڵکی دەکەن] .**

---

[1] رواه الإمام أحمد في المسند : (١٢٨٦١) ت / شعيب الأرناؤوط وقال : إسناده صحيح على شرط مسلم ، وأبو داود : (٤٨٧٨) ، وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب : (٢٨٣٩) .

يَخْمِشُونَ : أي : يجرحون ، يَأْكُلُونَ لُحُومَ النَّاسِ : أي : يغتابونهم .

## فەزڵ و گەورەیی

### كراوەیەتی و چاوپۆشی كردن لە كڕین و فرۆشتندا

پێغەمبــەر (ﷺ) فەرموویــەتی : ((رَحِمَ اللَّهُ رَجُلاً سَمْحًا إِذَا بَاعَ ، وَإِذَا اشْتَرَى ، وَإِذَا اقْتَضَى)) [البخاري : (١٩٣٤)] .

**واتە : خوا ڕەحم بەو پیـاوە بكـات كـە كـراوە و یارمەتیـدەرە لـە كاتێكدا كـە دەفرۆشێت و لە كاتێكیشدا كە دەكڕێت و لە كاتێكیشدا كە داوای قەرز دەكاتەوە.**

### حەق و مافــی موسڵمان لەسەر موسڵمان

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قَالَ : ((حَقُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ سِتٌّ)) ، قِيلَ : مَا هُنَّ يَا رَسُولَ اللَّهِ ؟ قَالَ : ((إِذَا لَقِيتَهُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ ، وَإِذَا دَعَاكَ فَأَجِبْهُ ، وَإِذَا اسْتَنْ□حَكَ فَانْ□حْ لَهُ ، وَإِذَا عَطَسَ فَحَمِدَ اللَّهَ فَشَمِّتْهُ ، وَإِذَا مَرِضَ فَعُدْهُ ، وَإِذَا مَاتَ فَاتَّبِعْهُ)) [مسلم : (٤٠٢٣)] .

**واتە : مافـی موسڵمان بەسەر موسڵمانەوە شەشە .**

**وترا : ئەو مافانە چین ئەی پێغەمبەری خوا ؟**

**فەرمووی :**

١ ـ ئه‌گه‌ر پی‌ی گه‌یشتیت سه‌لامی لێبكه .

٢ ـ وه ئه‌گه‌ر ده‌عوه‌تی كردیت وه‌ڵامی بده‌ره‌وه .

٣ ـ وه ئه‌گه‌ر داوای ئامۆژگاری لێت كرد ئامۆژگاری بكه .

٤ ـ وه ئه‌گه‌ر پژمی و سوپاسی خوای كرد دوعای بۆ بكه .

٥ ـ وه ئه‌گه‌ر نه‌خۆش كه‌وت به‌سه‌ری بكه‌ره‌وه .

٦ ـ وه ئه‌گه‌ر مرد شوێنی جه‌نازه‌كه‌ی بكه‌وه .

## چی ده‌وترێت له كاتی به‌سه‌ركردنه‌وه‌ی نه‌خۆشدا

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) قَالَ : كَانَ النَّبِيُّ (ﷺ) إِذَا دَخَلَ عَلَى مَرِيضٍ يَعُودُهُ قَالَ : ((**لاَ بَأْسَ طَهُورٌ إِنْ شَاءَ اللَّهُ**)) [البخاري : (٥٦٥٦)] .

واته : پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ئه‌گه‌ر بڕۆیشتایه‌ت بۆ به‌سه‌ركردنه‌وه‌ی نه‌خۆشێك پی‌ی ده‌فه‌رموو : ئه‌م نه‌خۆشی‌یه هیچ نی‌یه و پاك كه‌ره‌وه و لابه‌ری تاوانه‌كانه به ویستی خوا .

## فه‌زڵ و گه‌وره‌یی ته‌وقه‌كردن له نێوان موسڵمانان‌دا

پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رموویه‌تی : ((مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَلْتَقِيَانِ فَيَتَصَافَحَانِ إِلاَّ غُفِرَ لَهُمَا قَبْلَ أَنْ يَفْتَرِقَا)) [الترمذي : (٢٧٢٧) وصححه الألباني] .

واته : هیچ دوو موسڵمانێك نی‌یه بگه‌ن به یه‌كتر و له‌گه‌ڵ یه‌كتردا ته‌وقه بكه‌ن ئیللا خوا له هه‌ردووكیان خۆشده‌بێت پێش ئه‌وه‌ی كه له یه‌كتر جیاببنه‌وه .

## فه‌زڵ و گه‌وره‌یی داواكردنی شه‌هیدبوون له خوا

پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رموویه‌تی : ((مَنْ سَأَلَ اللَّهَ الشَّهَادَةَ بِصِدْقٍ بَلَّغَهُ اللَّهُ مَنَازِلَ الشُّهَدَاءِ وَإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ)) [مسلم : (٥٠٣٩)] .

واته : هه‌ركه‌سێك به‌ڕاستگۆییه‌وه داوای شه‌هیدبوون له خوا بكات ئه‌وا خوا ده‌یگه‌یه‌نێته پله‌ی شه‌هیده‌كان ئه‌گه‌ر چی له‌سه‌ر جێگاكه‌شی بمرێت .

## هاندان له‌سه‌ر بژاردنی قه‌رزی سه‌ر مردوو

پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رموویه‌تی : ((نَفْسُ الْمُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِهِ حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ))[1].

---

[1] رواه أحمد : (٥١٥٥) ، والترمذي : (١٠٧٩) ، وصححه الألباني في صحيح الجامع : (٦٧٧٩) وصحيح سنن الترمذي رقم : (١٠٧٨) وصحيح سنن ابن ماجه رقم : (٢٤١٣) .

مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِهِ : أي محبوسة عن وصول اللذات إليها .

واتــه : (ڕۆح و گیـانی) ئیمانـدار بــه هـۆی ئـه‌و قــه‌رزه‌وه كـه لـه سـه‌ریه‌تی به‌ستراوه‌ته‌وه له گه‌یشتنی به خۆشی‌یه‌كانی تاوه‌كو بۆی ده‌درێته‌وه .

## فه‌زڵ و گه‌وره‌یی نوێژی جه‌نازه

پێغه‌مبــه‌ر (ﷺ) فه‌رموویــه‌تی : ((مَنْ شَهِدَ الْجَنَازَةَ حَتَّى يُصَلَّى عَلَيْهَا فَلَهُ قِيرَاطٌ ، وَمَنْ شَهِدَهَا حَتَّى تُدْفَنَ فَلَهُ قِيرَاطَانِ ، قِيلَ : وَمَا الْقِيرَاطَانِ ؟ قَالَ : مِثْلُ الْجَبَلَيْنِ الْعَظِيمَيْنِ)) [متفق عليه] .

واته : هه‌ركه‌سێك ئاماده‌ی جه‌نازه‌یه‌ك ببێت تـاوه‌كو نوێـژی له‌سـه‌ر ده‌كرێت ئه‌وا یه‌ك (قِيرَاط)ی بۆ هه‌یه ، وه هه‌ركه‌سێك ئاماده‌ی ببێت تاوه‌كو ده‌نێژرێت ئه‌وا دوو (قِيرَاط)ی بۆ هه‌یه .

وترا : دوو (قِيرَاط) چی‌یه ؟

فه‌رمووی : وه‌كو دوو شاخی گه‌وره وان .

## چۆنێتی نوێژکردن لەسەر مردوو

سوننەتە ئیمام و پێشنوێژ لە پشت سەری پیاوەوە و لە پشت ناوەڕاستی ئافرەتەوە بوەستێت ، وە چوار (اللَّهُ أَكْبَر)ی لەسەر بکات بەم شێوازەی کە دێت :

١ ـ (اللَّهُ أَكْبَر)ی یەکەم دەکات : و هەردوو دەستی بەرز دەکاتەوە تاوەکو ئاست هەردوو شانی یان هەردوو گوێی ، بە هەمان شێوە لە باقی تری (اللَّهُ أَكْبَر)ەکاندا ، ئەنجا دەستی ڕاستی دەخاتە سەر پشت دەستی چەپی و لەسەر سنگی دایدەنێت هەروەکو چۆن لە نوێژەکاندا وادەکات ، وە پەنادەگرێت بە خوا لە شەیتانی دەرکراو لە ڕەحمەتی خوا و (بسم الله الرحمن الرحيم) دەڵێت و ئەنجا بە کپی سورەتی فاتیحە دەخوێنێت .

٢ ـ (اللَّهُ أَكْبَر)ی دووەم دەکات : و صەڵاوات دەدات لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) و دەڵێت :

(اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ) .

٣ ـ (اللَّهُ أَكْبَر)ی سێیەم دەکات : و بە دڵسۆزیەوە دوعا بۆ مردووەکە دەکات بەوەی کە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتووە ، لەوانەش فەرمایشتی پێغەمبەر (ﷺ) :

(اللَّهُـمَّ اغْفِـرْ لَـهُ وَارْحَمْـهُ ، وَعَافِـهِ وَاعْـفُ عَنْـهُ ، وَأَكْـرِمْ نُزُلَـهُ ، وَوَسِّـعْ مُدْخَلَـهُ ، وَاغْسِلْهُ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ ، وَنَقِّهِ مِنَ الْخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ ، وَأَبْدِلْهُ دَارًا خَيْرًا مِنْ دَارِهِ ، وَأَهْلاً خَيْرًا مِنْ أَهْلِهِ ، وَزَوْجًا خَيْرًا مِنْ زَوْجِهِ ، وَأَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ ، وَأَعِذْهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ وَعَذَابِ النَّارِ) [مسلم : (٩٦٣)] .

واتە : خوایە لە ئەم مردووە خۆشببە و ڕەحمی پێبكە ، وە سەلامەتی بكـە و لـێی ببورە ، وە میوانداریەكـی ڕێزلێنراوی بكە ، وە گۆڕەكـەیی بۆ فـراوان بكـە ، وە بیشۆرە لە شـوێنەواری تاوانـەكانی بـە ئـاو و بـەفر و تـەرزە ، وە پاكوخـاوێنی بكەرەوە لە هەڵـە و تاوانەكانی وەكو چۆن پۆشاكێكی سپی لە چـڵك و لەكـە و پەڵــە پاكوخاوێن دەكرێتەوە ، وەماڵەكەیی بۆ بگۆڕەوە بە ماڵێك لە ئەوەی خۆی باشـتر ، وە كەسـوكارەكەیی بـۆ بگـۆڕەوە بـە كەسـوكارێك لـە ئـەوەی خـۆی باشـتر ، وە خێزانەكـەیی* بـۆ بگـۆڕەوە بـە خێزانێـك لـە ئـەوەی خـۆی باشـتر ، وە بیخـەرە بەهەشتەوە ، وە پەنای بـدە لە سـزای گۆڕ و لە سـزای ئاگری دۆزەخ .

---

* وە ئەگەر مردووەكە ئافرەت بوو ئەوا لێرەدا واتە : (وە مێردەكەیی بۆ بگۆڕەوە بە مێردێك لە ئەوەی خـۆی باشتر) .

**تێبینی** : مەبەست بە گۆڕینەوە لێرەدا بریتی‌یە لە گۆڕینەوەی سیفەتەكانی بۆ سیفاتی باشـتر و چـاكتر نەك خوودی مێردەكەیی بۆ بگۆردرێتەوە بە مێردێكی تر كە لە ئەو باشتر بێت !

بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێرەوە بۆ كتێبی (وتەی زانایانـی مەزهەبی ئیمامی شافعی ڕەحمەتی خوایان لێبێت سەبارەت بـە كات و شوێن و شێوازی سەرەخۆشی كردن و پرسە و تەعزێ گێڕان) لاپەڕە : (٤٩) . ـ وەرگێڕ ـ

هه‌روه‌ها فه‌رمایشتی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) : (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِحَيِّنَا وَمَيِّتِنَا ، وَشَاهِدِنَا وَغَائِبِنَا ، وَصَغِيرِنَا وَكَبِيرِنَا ، وَذَكَرِنَا وَأُنْثَانَا ، اللَّهُمَّ مَنْ أَحْيَيْتَهُ مِنَّا فَأَحْيِهِ عَلَى الإِسْلاَمِ ، وَمَنْ تَوَفَّيْتَهُ مِنَّا فَتَوَفَّهُ عَلَى الإِيمَانِ ، اللَّهُمَّ لاَ تَحْرِمْنَا أَجْرَهُ ، وَلاَ تُضِلَّنَا بَعْدَهُ) [ابن ماجه : (١٢٢٦) وصححه الألباني] .

واته : خوایه له زیندوو و مردوومان خۆشببه ، وه له ئاماده و نادیارمان ، وه له بچوك و گه‌وره‌مان ، وه له نێر و مێمان ، خوایه هه‌ركه‌سێك له ئێمه ده‌ژێنیت ئه‌وا له‌سه‌ر ئیسلام و ملكه‌چبوون بۆ دین بیژێنه ، وه هه‌ركه‌سێكیشمان لێده‌مرێنیت ئه‌وا له‌سه‌ر ئیمان بیمرێنه ، خوایه بێبه‌ش و مه‌حروممان مه‌كه له خێر و پاداشتی نوێژ له‌سه‌ر كردن و دوعاكردنمان بۆی ، وه له پاش ئه‌ویش گۆمڕامان مه‌كه .

❁ وه ئه‌گه‌ر مردووه‌كه مێیینه بوو ئه‌وا ده‌ڵێت : (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهَا وَارْحَمْهَا ...) هتد .

❁ وه ئه‌گه‌ر چه‌ند جه‌نازه‌یه‌ك بوو ئه‌وا ده‌ڵێت : (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُمْ وَارْحَمْهُمْ ...) هتد .

❁ وه ئه‌گه‌ر جه‌نازه‌ی (منداڵی له‌بارچوو) بوو كه بریتییه له‌و منداڵه‌ی ته‌مه‌نی چوار مانگ و به‌ره‌و سه‌ره‌وه‌یه ئه‌وا دوعا بۆ باوك و دایكی ده‌كات به

لـێخۆشبوون و ڕەحـم پـێكردنيـان لەبـەر فەرمايشـتی پێغەمبـەر (ﷺ) : ((وَالسِّقْطُ يُصَلَّى عَلَيْهِ وَيُدْعَى لِوَالِدَيْهِ بِالْمَغْفِرَةِ وَالرَّحْمَةِ)) [أبو داود : (٣١٨٠) وصححه الألباني] .

واتە : وە (منداڵی لەبارچوو) نوێژی لەسەر دەكرێت و دوعـا بـۆ بـاوك و دايكـی دەكرێت بە لـێخۆشبوون و ڕەحم پـێكردنيان .

وە چاكيشە بوترێت : (اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ ذُخْرَاً لِوَالِدَيْهِ ، وَفَرَطَاً وَاَجْرَاً وَشَفِيْعَاً مُجَابَاً ، اللَّهُمَّ ثَقِّلْ بِهِ مَوَازِيْنَهُمَا ، وَأَعْظِمْ بِهِ أُجُوْرَهُمَا ، وَأَلْحِقْهُ بِصَالِحِ سَلَفِ الْمُؤْمِنِيْنَ ، وَاجْعَلْهُ فِي كَفَالَةِ إِبْرَاهِيمَ ، وَقِهِ بِرَحْمَتِكَ عَذَابَ الْجَحِيْمِ) .

٤ ـ (اللَّهُ أَكْبَر)ی چوارەم دەكات : و كەمێك بێدەنگ دەبێت ئەنجا يـەك سـەلام دەداتەوە بە لای ڕاستيدا .

۞ هەركەسێك شتێك لە (اللَّهُ أَكْبَر)ەكانـی لە دەست چوو بوو ئەوا ئـەوەی كـە پێيدەگات لەگـەڵ ئيمامـدا ئـەوە بـە سـەرەتای نوێژەكـەی دادەنێـت ، جـا ئەگـەر گەيشـتە (اللَّهُ أَكْبَر)ی چـوارەم ئـەوا دوای ئـەوە فاتيحـە دەخوێنێـت [كـە بـۆ ئـەم دەبێتـە (اللَّهُ أَكْبَر)ی يەكـەم] و ئـەنجا (اللَّهُ أَكْبَر)ی دووەم دەكـات : و صـەڵاوات دەدات لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) و بەو شێوەيە .

۞ وە ئەگەر مەترسی ئەوەی هەبوو كـە جەنازەكـە هـەڵبگرن ئـەوا كـەمترينی واجبەكەی بەسە بەوەی كەوا لە دوای (اللَّهُ أَكْبَر)ی دووەم بڵێـت : (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى

مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ) ، وه له دوای (اللَّهُ أَكْبَرُ)ی سێیه‌م بلێت : (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ وَارْحَمْهُ) ، وه له دوای (اللَّهُ أَكْبَرُ)ی چواره‌م سه‌لام بداته‌وه .

## زیكره‌كانی به‌یانیان و ئێواران

سوننه‌ت وایه موسڵمان به‌یانیان له پێش خۆرهه‌ڵاتن و ئێوارانیش له پێش خۆرئاوابوون ئه‌م زیكرانه‌ی لای خواره‌وه بخوێنێت :

❁ ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞۚ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَۚ وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَاۚ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ٢٥٥ ﴾ [البقرة] [النسائي : (١٠٧٢٨٠)] [له به‌یانیان و ئێوارانیشدا] .

❁ ﴿ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾ ، ﴿ قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ﴾ ، ﴿ قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴾ [الترمذي : (٥٨٤)] [هه‌ر سێ سوره‌ته‌كه به كامڵی سێ جار ده‌خوێنرێن له به‌یانیان و ئێوارانیشدا] .

❁ ((أَصْبَحْنَا وَأَصْبَحَ* الْمُلْكُ لِلَّهِ ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ، رَبِّ أَسْأَلُكَ خَيْرَ مَا فِي هَذَا الْيَوْمِ وَخَيْرَ مَا بَعْدَهُ ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا فِي هَذَا الْيَوْمِ وَشَرِّ مَا بَعْدَهُ ، رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَسُوءِ الْكِبَرِ ، رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابٍ فِي النَّارِ وَعَذَابٍ فِي الْقَبْرِ)) [مسلم : (٧٥)] **[لە بەیانیان و ئێوارانیشدا]** .

❁ ((اللَّهُمَّ بِكَ أَصْبَحْنَا وَبِكَ أَمْسَيْنَا ، وَبِكَ نَحْيَا وَبِكَ نَمُوتُ ، وَإِلَيْكَ النُّشُورُ)) ، **بەڵام ئێواران دەڵێت :** ((اللَّهُمَّ **بِكَ أَمْسَيْنَا وَبِكَ أَصْبَحْنَا** ، وَبِكَ نَحْيَا وَبِكَ نَمُوتُ ، وَإِلَيْكَ **الْمَصِيرُ**)) [الترمذي : (٧٥)] .

❁ ((أَصْبَحْنَا** عَلَى فِطْرَةِ الإِسْلاَمِ ، وَعَلَى كَلِمَةِ الإِخْلاَصِ ، وَعَلَى دِينِ نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ (ﷺ) وَعَلَى مِلَّةِ أَبِيْنَا إِبْرَاهِيمَ حَنِيفاً مُسْلِماً ، وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ)) [أحمد : (١٥٣٦٣)] **[لە بەیانیان و ئێوارانیشدا]** .

---

* **بەیانیان ئەوە دەڵێت ، بەڵام ئێواران لە بری** ((**أَصْبَحْنَا وَأَصْبَحَ** الْمُلْكُ لِلَّهِ ... رَبِّ أَسْأَلُكَ خَيْرَ مَا فِي **هَذَا الْيَوْمِ** وَخَيْرَ مَا **بَعْدَهُ** ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا فِي **هَذَا الْيَوْمِ** وَشَرِّ مَا **بَعْدَهُ** ...)) **دەڵێت :** ((**أَمْسَيْنَا وَأَمْسَى** الْمُلْكُ لِلَّهِ ... رَبِّ أَسْأَلُكَ خَيْرَ مَا فِي **هَذِهِ اللَّيْلَةِ** وَخَيْرَ مَا **بَعْدَهَا** ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا فِي **هَذِهِ اللَّيْلَةِ** وَشَرِّ مَا **بَعْدَهَا** ...)) .

** **بەیانیان ئەوە دەڵێت ، بەڵام ئێواران لە بری** ((**أَصْبَحْنَا** عَلَى فِطْرَةِ الإِسْلاَمِ ...)) **دەڵێت :** ((**أَمْسَيْنَا** عَلَى فِطْرَةِ الإِسْلاَمِ ...)) .

❁ ((اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي دِينِي وَدُنْيَايَ وَأَهْلِي وَمَالِي ، اللَّهُمَّ اسْتُرْ عَوْرَاتِي ، وَآمِنْ رَوْعَاتِي ، اللَّهُمَّ احْفَظْنِي مِنْ بَيْنِ يَدَيَّ وَمِنْ خَلْفِي وَعَنْ يَمِينِي وَعَنْ شِمَالِي وَمِنْ فَوْقِي ، وَأَعُوذُ بِعَظَمَتِكَ أَنْ أُغْتَالَ مِنْ تَحْتِي)) [أبو داود : (٥٠٧٦)] **[لە بەیانیان و ئێوارانیشدا]** .

❁ ((اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ ، وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي ، فَاغْفِرْ لِي ، فَإِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ

إِلاَّ أَنْتَ)) [البخاري : (٦٣٠٦)] **[لە بەیانیان و ئێوارانیشدا]** .

❁ ((اللَّهُمَّ عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ ، فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ ، رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي وَمِنْ شَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ)) [الترمذي : (٣٧٢٠)] .

**[لە بەیانیان و ئێوارانیشدا]** .

❁ ((بِسْمِ اللَّهِ الَّذِي لاَ يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَيْءٌ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاءِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ)) [الترمذي : (٣٣٨٨)] .

**[سێ جار لە بەیانیان و ئێوارانیشدا]** .

❁ ((رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا وَبِمُحَمَّدٍ (ﷺ) نَبِيًّا)) [صحيح الترغيب والترهيب : (٦٥٧) ، وسلسلة الأحاديث الصحيحة : (٢٦٨٦)] .

**[یەك جار تەنها لە بەیانیاندا] .**

❁ ((أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ)) [مسلم : (٢٧٠٨) ، وأحمد : (٨١١٧)] **[سێ جار تەنها لە ئێوارانداا] .**

❁ ((يَا حَيُّ يَا قَيُّومُ بِرَحْمَتِكَ أَسْتَغِيثُ ، أَصْلِحْ لِي شَأْنِي كُلَّهُ ، وَلاَ تَكِلْنِي إِلَى نَفْسِي طَرْفَةَ عَيْنٍ)) [النسائي : (١٠٨٣٠) ، وحسنه الألباني] .

**[لە بەیانیان و ئێوارانیشدا] .**

❁ ((سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ : عَدَدَ خَلْقِهِ ، وَرِضَا نَفْسِهِ ، وَزِنَةَ عَرْشِهِ ، وَمِدَادَ كَلِمَاتِهِ)) [مسلم : (٢٧٢٦)] .

**[سێ جار تەنها لە بەیانیاندا] .**

❁ ((اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ عِلْمًا نَافِعًا ، وَرِزْقًا طَيِّبًا ، وَعَمَلاً مُتَقَبَّلاً)) [ابن ماجه : (٩٢٥)] .

**[یەك جار تەنها لە بەیانیاندا] .**

❁ ((لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)) [البخاري : (٦٠٤٠)] .

[١٠٠ جار تەنها لە بەیانیاندا] .

❁ ((سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ)) [مسلم : (٢٦٩١)] .

[١٠٠ جار لە بەیانیاندا و ئێوارانیشدا] .

## کردەوەکان بە پێی کۆتاییەکانیەتی

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : ((إِنَّ الْعَبْدَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ النَّارِ وَإِنَّهُ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ ، وَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ الْجَنَّةِ وَإِنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ ، وَإِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالْخَوَاتِيمِ)) [البخاري : (٦٦٠٧)] .

**واتە : بەڕاستی عەبدی وا هەیە کردەوە دەکات بە کردەوەی ئەهلی ئاگر و خۆی لە ئەهلی بەهەشتە ، وە هی وایش هەیە کردەوە دەکات بە کردەوەی ئەهلی بەهەشت و خۆی لە ئەهلی ئاگرە ، وە بەڕاستی کردەوەکان کورتهەڵهێنراون لەسەر کۆتاییەکانیان .**

# کۆتایی

برای خوێنەری ڕێزدارم : بەڕاستی تۆ بە تێڕامانت لـەم (**گە نجینە گەورانــە**) و کردەوە کـردن بـەوەی کـە تێیانـدا هـاتووە بالأنسـی چـاکەکانت لـە دوارۆژدا زیـاد دەکەیت زیادکردنێکی گەورە .

وەکو ئەوەی کە چەندین سـاڵی زۆر درێژخایـەن ژیابیـت و تەمـەنت کردبێـت و چەندین کردەوەی چاکت تێدا کردبێت ... لەکاتێکدا کە ئەم کردەوانە سوپاس بـۆ خوا سەهل و ئاسانن .

بۆیە ئیمانداری ژیر و عـاقڵ ئـەو کەسـەیە کـە کاتـەکان و هـەل و دەرفەتـەکان دەقۆزێتەوە بۆ کۆکردنەوەی توێشوو بۆ دواڕۆژ .

وە لە قیامەتدا هەمووان پەشیمان دەبنەوە :

چاکەکار ئاواتەخوازە بەوەی کە چاکە و حەسەناتی زیاتری هەبوایەت .

وە خراپەکاریش پەشیمانە و ئاواتەخوازە بەوەی کـە هـەرگیز خراپـە و تـاوانی نەکردایەت .

کەواتــە : توخــوا توخــوا ئــەی بــرام : هــەل و دەرفەتــەکان بــە فیڕۆمــەدە و کاتەکانت بە دەستکەوت دەست بخە بە ئەنجامـدانی کـردەوە چـاکەکان ، چـونکە کات بریتی‌یە لە ژیان ، وە دونیایش کێڵگەی دواڕۆژە .

وَصَلَّى اللَّهُ وَسَلَّمَ عَلَى نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِين

# ناوەڕۆک

